عەبدولموتەلیب عەبدوڵڵا



# خوێندنەوەی پەراوێز
# پەراوێزی خوێندنەوە

(نومایشی فیکری سەردەم لە چەند پەراوێزی)

چاپی یەکەم

حکومەتی هەرێمی کوردستان
وەزارەتی ڕۆشنبیری
بەڕێوەبەرێتیی گشتیی چاپ و بڵاوکردنەوە
زنجیرە (٣٩٥)

عەبدولموتەلیب عەبدوڵڵا

# خوێندنەوەی پەراوێز
# پەراوێزی خوێندنەوە

## (نومایشی فیکری سەردەم لە چەند پەراوێزێ)

سلێمانی ٢٠٠٥

# خوێندنەوەی پەراوێز
# پەراوێزی خوێندنەوە
# (نومایشی فیکری سەردەم لە چەند پەراوێزێ)


نووسینی: عەبدولموتەلیب عەبدوڵڵا

بابەت: لێکۆڵینەوە

تایپ: پەیام ئەحمەد

نەخشەسازی کۆمپیوتەر: مەهری ئەحمەد

هەڵەبڕی: نووسەر

سەرپەرشتیاری چاپ: سەلام فاتح

نەخشەسازی بەرگ: دیاری جەمال

چاپ: چاپخانەی کارۆ

تیراژ: ١٠٠٠ دانە

ژمارەی سپاردن: (٩٠٨)ی ساڵی ٢٠٠٥ی وەزارەتی ڕۆشنبیری پێدراوە

www.roshnberiekurd.com

# ناوەڕۆک

## پێشەکی:

هەر لە ڕێگەی ناونیشانی ئەو کتێبەی بەردەستان دەشێ بە شێوەی چەند پەراوێزێک فیکری سەردەم بخوێنینەوە. نەک بەو مانایەی ئەو پەراوێزکارییە لە چەمکەکانی فیکرو فەلسەفەو مەعریفەی سەردەم کەم بکاتەوە. بەڵکو ڕاستەوخۆ بەو مانایەی کە دەشێ لە پەراوێزەوە بەدوای بەهای فیکرو فەلسەفەو مەعریفەدا بچین و بە ڕەنگێکی دیکەو بە جیهانبینیەکی دیکە هەڵیگێڕینەوە. یان بە مانا (دریدا)ییەکە ئەمڕۆ پەراوێز جیاوازییەکان و جێکەوتەکانی تیا دێتە بەرهەم و هەر لەوێشەوە دەشێ ڕەخنە ئاڕاستەی سینترالیزمی خۆرئاوایی بکەین.

ئەو پەراوێزەی لەو کتێبەدایە ڕەنگە چەند سەرە قەڵەمێک بێت بۆ بیرکردنەوەو بەدواداچوونی وێترو واڵاکردنی دەرگایەک بێ بۆ تەماشاکردن و ڕەنگکردنی جیاوازییەکان. بە دیوەکەی دیکەش ناسینی چەمکو دنیابینی و وێناکردنی چەمکەکانە. ئەوەش لە لایەک ئەگەر پەیوەندی گرتن بێ لەگەڵ خۆرئاوا. لەلایەکی دیکە خستنە ڕووی کاریگەری و قسەکردنە لەمەڕ بیرکردنەوە.

له بەشی یەکەمدا قسە لەسەر کلتورو ئەو بەشە زیندووەی کلتور کراوە کە دەشێ لەگەڵماندا ڕێ بکات. بەو مانایەی کە هەڵگری جۆرەکانی دنیابینی و ئیبداع و ڕەخنەو بەدواداچوونە. هەروەک قسە لە پێناسەو شوناس کراوە کە دەشێ لەدەرەوەی پێناسەکردنە کۆنەکانەوە ببنە هەڵگری کۆمەڵێک ڕەگەزو کۆمەڵێک نیشانەی ناوێتە. بەو مانایەش ئەمڕۆی شوناس ئەمڕۆی ڕەنگاوڕەنگی نیشانەکان و ئاگایی و ڕۆشنبیریی و فرە ڕەهەندییە. هەرگیز ئەمڕۆی شوناس لە تاکە ڕەگەزێکدا بەرجەستە نابێ. هەرگیز کارکردن نییە لەسەر پەرچەکردارو تەعبیر لە هەڵچوونی کاتی ناکات. بەڵکو بەرجەستەکردنی ناگاییو جیاوازیو هۆشیاری مرۆڤایەتی دەگەیەنێت. هەر لەو بەشەدا باسی بە جیهانیبوون و بۆمبی زانیارییەکان و فەزای سبریانی کراوە. لەوێشەوە قسە لەوە کراوە کە دەشێ تۆ لە ڕێگەی کەلتوری خۆتەوە بەشداری لە بەجیهانیبوون بکەیت. نەک خۆت بەنامۆو پەراوێزکراو بێتە بەرچاو. ناشێ داهێنانی مرۆڤایەتی هەرتەنها بە کلتورێک پەیوەست بکەین. چونکە بمانەوێ و نەمانەوێ تەواوی مرۆڤایەتی بەجۆرێک لە جۆرەکان لەو هوشیاری و ئاگاییەی کە ئەمڕۆ دەبینری بەشداری خۆی هەیە.

لەبەشی دووەمدا هەوڵدراوە لە ڕێگەی (فرۆید)ەوە قسە لە گەورەترین گرفتەکانی مرۆیی بکەین و ڕەهەندەکانی بەو شێوە دەروونشیکارییەی کە (فرۆید) دایهێناوە بخەینە بەرچاو. هەروەک چۆن ئەو بەشە هەڵگری گیروگرفتەکانی ناوەوەی مرۆڤە. بە دیوەکەی دیکەش هەڵگری ئەو ئەهیلیزمیەتەیە کە دەرەوە دروستی دەکات. لێرەدا باس لە یەکێک لە دیاردە هەرە هەڵناوساوەکان دەکرێ کە ئەویش دەمارگیرییە. وەک چۆن باسی هەڵچوون و شیزۆفرینیاش کراوە کە ئەمڕۆ بەشێکی زۆری دنیای بەخۆوە تلاندۆتەوە. کەواتە لەو بەشەدا بە یارمەتی (فرۆید) نەخشەی ناوەوەی مرۆڤ و پاڵنەرو هۆیەکان و دیاردەو نیشانەکانی خراوەتە بەچاو. هەر لەوێشەوە ڕۆڵی سێکس و پەنابردنە بەر سێکس لە پاڵ خواردنەوەی مادده ئەلکهولییەکان کە بێگومان ئەمڕۆ بوونەتە یەکێک لەهەرە سەرچاوە گەورەکانی ئەهیلیزم و پووچی. هەر لەوێشەوە ڕەوایی بەخشین بەچێژو خۆشی هەڵدەگرینەوە. بەو مانایەش هەموو شتێک ڕەوایەو مرۆڤ دەبێتە ستایشکەری پەشۆکاوی و شیزۆفرینیا بەپلەی باڵای هوشیاری لەقەڵەم دەدات.

به بڕوای من ئەمڕۆ مرۆڤی سەردەم بەو مانایەی کە باوە دەست بۆ هەموو شتێک دەبات. ئەو سەرکێشییەش ڕەنگە ئەگەر نەتوانی لە خزمەت داهێناندا خەرجی بکەیت دووچاری سەرلێشێواوی و وێڵگەردییت بکاتەوە. دواجار بە بیرهێنانەوەی (فرۆید) ئەوەمان پێدەڵێ کە مرۆڤ سەرەڕای یاخی بوونی بەڵام هەر بە کۆیلەی لیبیدۆ دەمێنێتەوە. ئەگەر ئەوە دیوێکی مرۆڤ بێ. دیوەکەی دیکە نابوورییە بەهەموو ماناکانییەوە. هەر لەو دەرئەنجامەشدا قسەکردن لە (فرۆید)و دەروونشیکاری هەر تەنها هەڵدانەوەی لیبیدۆ نییە. بەڵکو گەڕانەوەیە بۆ مرۆڤێک ئەگەر چی خۆیشی بە ئازادو خودا بێتە بەرچاو، بەڵام لە ناوەوە هەر گیرۆدەو دیلە.

**عەبدولموتەلیب عەبدوڵڵا**

**هەولێر ٢٠٠٥/٨/٧**

# خودو بابەت لە پرۆسیسەکردنی ڕەخنەدا

خوێندنەوە بەشێوەیەکی گشتی کۆمەڵێک لایەنی بنەڕەتی لە خۆیدا هەڵگرتووە. بۆ بەرقەرار کردنی ڕێگای گونجاوو لەبار تاکو لەوێوە مامەڵە لەگەڵ خودی دەقدا بکات. ئەو مامەڵە کردنەش مەرج نییە خۆی بەیەک لایەن. یاخود یەک ڕەگەزو یەک دەلالەتی چەسپاو خەریک بکات. بە مانایەکی دیکە دەشێ لە دووتوێی کۆمەڵێک خوێندنەوەی جۆراوجۆرەوە بتوانین پەنجە بخەینە سەر جیهانبینی میتۆدی دیاریکراو. بەر لەوەی تەسەورێکی پێشینە بۆ لە یەکتریککردنەوەی خوێندنەوەکان لە ئارادا هەبێت. واتە دەشێ گشتی بەرهەمهاتوو لە دووتوێی هەڵوەشاندنەوەو پارچە پارچەکردنیدا بخوێنینەوە. هەروەک چۆن بەهەمان شێوەش دەشێ لە دووتوێی خوێندنەوەی پارچەکانەوە دواجار گشتی بەرهەمهاتوو خۆی بدۆزێتەوە.

ئەگەر لە دەرەوەی ھەژموونی دەقەوە بە پارچەکانەوە بەرەو گشتی ھەنگاو بنێین. لەلایەک خوێنەر لە تەمومژ ڕزگار دەکەین. لەلایەکی دیکەش ڕێگا دروستەکانی خوێندنی دەق لە شێوان دەپارێزین. بێگومان خوێندنەوە ھەر تەنھا توێژینەوەو لێکۆڵینەوە ناگرێتەوە. بەڵکو دەشی لەم بوارەش گوزەر بکاو لە دووتوێی ئاگایی خوێنی خوێنەرەوە پێشنیاری گونجاو بخاتەوە. کە لە ھەمان کاتدا لەگەڵ ئاستی فیکری خوێندراوە لە خاڵێک لە خاڵەکاندا یەکبگرێتەوەو لە چەندان خاڵیشدا دژ بوەستێت. یاخود بە مانایەکی دیکە ڕەنگە لە دووتوێی تاکە میتۆدێک و تاکە جیھانبینییەکدا بتوانین کۆمەڵێک خوێندنەوەی جیاجیا بۆ دەقێک بە ئەنجام بگەیەنین. وەک چۆن شیاویشە تاکە دەقێک بە چەندان میتۆدو ڕوئیای جیاجیا بخوێنینەوە. ئەگەر خوێندنەوەی یەکەم بکەوێتە دووتوێی ئیشکالیەتی مەعریفیو ئایدۆلۆجی میتۆدی دیاریکراو. بێگومان لە دووەمدا خوێنی دەق ھەمان ئیشکالیەت بەرھەم دێنی. بەواتایەکی دیکە ئەگەر لە خوێندنەوەی یەکەمدا بتوانین ھاوچەرخێتی بۆ میتۆدی دیاریکراو فەراھەم بکەین. ئەوا لە دووەمدا دەق ئەو بایەخە بۆ خۆی دەبات. بەڵام لە دەرەوەی خوێندنەوەی ھاوچەرخانەو دەقی ھاوچەرخدا. ئەگەر خوێندنەوە تاکە پێناسەیەک بۆ خۆی بە ڕەوا بزانێ ئەوەیە کە خوێندنەوە: گواستنەوەی دەقو میتۆدە بۆ بواری گرنگیدانی خوێنەر. ئەوەش وا دەکات خوێنەر لای خۆی شتەکان تەوزیف بکات. ھەر لە توێی ئەو تەوزیف کردنەشەوە تەماھی خوێندنەوە دەبێت یاخود واز لە خوێنی خۆی دەھێنێو دووبارە لە ئاستێکی دیکەدا خۆی بونیاد دەنێتەوە. ھەروەک بەھەمان شێوەش دەق بونیاد دەنێتەوە. کەواتە کاتێک خوێندنەوەی یەکەم بەھۆی ھاوچەرخیکردنی میتۆدەوە دەق لە ئێمە دادەبڕێت. ئەوا خوێندنەوەی دووەم میتۆد دەخاتە دواوەو دەق لەگەڵ ئێمەدا بەڕێ دەخات.

کەواتە کاتێ لەسەرەوە وتمان خوێندنەوە ھەر تەنھا توێژینەوەو دیراسەکردن نییە. ویستمان بڵێین بەھۆی ئاگایی و ڕۆشنبیریی فرە مەودای خوێنەرەوە دەتوانین لە کۆی میتۆدەکانەوە پەنجە بۆ ھیرمۆنیتیکا درێژ بکەین. لە دووتوێی ھیرمۆنیتیکاشەوە پەیوەندییەکانی "دابڕان و گەیشتن" ھەروەک دوو ھەنگاوی سەرەکی خوێندنەوە لە توێی خوێندراوەدا نمایش بکەن.

دەشێ پێکەوەلکانی هەندێ لە دیاردەکان لە ڕێگەی بەرهەمهێنانی کۆمەڵێک چەمک و پرنسیپی جیاوازەوە خوێنێک لە خۆ بگرێت. پرسیاری ئەو خوێنەش هەرگیز ناکرێت وەک پرسیارێکی هەمەکی سەیر بکرێت. بەڵکو پرسیارێکە ئەگەر لەلایەک کۆی بەشەکان (ئەو پرسیارەیان) بەرزکردبێتەوە، ئەوا لەلایەکی دیکە ئەویدی بەرامبەر. یان خوێنەکانی دیکە دەستیان لە دروست کردنیدا هەیە. بەو مانایەش دەتوانین بڵێین هەموو ئەوانە بەرئەنجامی یەک واقیعنو یەک کێشە کۆیاندەکاتەوە. ئەگەر وەک (جابری) ئەو بەرئەنجامە بە عەقڵی عەرەبییەوە پەیوەست بکەین. دەشێ بڵێین کێشەی عەقڵی عەرەبی کێشەی مردنی خوێنێکە کە تەواوی شتەکانی بۆ دەرەوە بەیان کردووە. ئەگەر لەلایەک شاردنەوەی ئەو خوێنە، میتافیزیکای عەقڵی عەرەبی لە خۆ بگرێت، تاوەکو لەم خاڵەوە خزمەت پێشکەش بە سیستەمی مەعریفی بکات. دەشێ بڵێین ئەو سیستەمە مەعریفییە (کەمالی تاک لایەن) لەپێناو (کەمالی هەمەلایەن)دا دەخاتە ڕوو. بەم واتایەش دەشێ ئەزمەی عەقڵی عەرەبی لە ماهیەتی ئەو سیستەمەوە بێ کە کردەی عەقڵی لە توێی خۆیدا نوقم کردووە، یاخود ئەزمەی ئەو سیستەمە مەعریفییە بێ کە تەواوی کێشەو ململانێکانی لە خۆیدا خنکاندووە بۆ ئەوەی وەک حەقیقەتێکی ڕەها خۆی بەرجەستە بکات. بێگومان خود ئەو مەسەلەیە ئەگەرچی بە شێوەی جیاجیا خراوەتە بەر چاوی خوێنەران بەڵام لە هەمان کاتیشدا لێرەدا پێویستی بە بەدواداچوونی زیتر هەبوو. هیوادارم لە میانی ئەو خوێندنەوەیەدا و لە میانی ڕەخنەکانی (جابری) بۆ عەقڵی عەرەبی بتوانین ڕوونتر قسە لەم مەسەلەیە بکەین. ڕەنگە پرسیاری عەرەبی وەک (جابری) پۆلێنی دەکات لەم سێ تەوەرەیەدا خۆی بنوێنێ :

**- چۆن سەربەرزی ژیاری دەگەڕێنینەوە.. چۆن کەلەپورمان زیندوو دەکەینەوە؟**

ئەو دوو پرسیارە یەکێک لە گفتوگۆ سەرەکییەکانی فیکری عەرەبی و ئیشکالیەتی فیکری عەرەبی نوێ لەخۆ دەگرێت، دواجار سیستەمی پەیوەندییەکانیشیان دەکەوێتە نێوان (ڕابردوو – داهاتوو) لێرەدا ئێستا دەگۆڕێ، نەک بەو مانایەی کە ڕەفزە، بەڵکو بەو مانایەی کە ئامادەباشی ڕابردوو لە ئێستا بەهێزترە، تا ئەو پلەیەی کە وەک ئەڵتەرناتیڤێ پەل بۆ داهاتووش دەکوتێ و داگیری دەکا. تەواوی ئەو مەسەلەیەش ڕاستەوخۆ جەختکردنە

له (خود)و رەتکردنەوەی پێوەندگەکانی ئەویدییە. ئەو جەخت کردنەش دەشێ دژبوونەوەی ژیاری خۆرئاوا "چ لە ئاستی تاک، یان کۆ بەهەموو شێوەکانییەوە" بێ. بەڵام وەک دەزانین پرۆسەی تەئکیدکردن لە خود هەمیشە شێوەی سەرهەڵدانەوە (نکوێ) لەخۆ دەگرێت. یاخود بە مانایەکی دیکە بۆ دواوەو هێزش بردن هەر لەوێوە، لە فیکری عەرەبی نوێی عارچەرخدا بەشێوەیەک لە شێوەکان بەندە بە شەپۆلی سەلەفیەتەوە. واتە گەڕانەوەو زیندوو کردنەوە بەم شێوەیەو لە دووتوێی خوێندنەوەیەکی ئایدۆلۆژیانەدا. تەواوی وێنەی داهاتوو دەخاتە مەترسیو هەرەسهێنانەوە هەر لەدووتوێی ئەم پرۆسەیەوە داهاتووی ئایدیۆلۆژی عەرەبی بەهۆی پشتبەستن بە پرۆسەی سەرهەڵدانەوە. وا نیشانەدەات کە ئەوەی لە (ڕابردوو) تەواو کراوە، دەشێ لە داهاتووشدا بەجێبهێنرێت.

## - چۆن هاوچەرخانە دەژین... چۆن مامەڵە لەگەڵ کەلەپوور دەکەین؟

ئەو دوو پرسیارە دەچنە ناو یەکترو دەبنە تەوەرەی گفتوگۆکردنی ئیشکالیەتی فیکری عەرەبی. سیستەمی پەیوەندییەکانیشیان دەکەوێتە نێوان (ئێستا – ڕابردوو) بەڵام نەک ئێستای ئێمە. بەڵکو ئێستای ئەوریی، چونکە ئەورووپا وەک خوێنێک کۆنترۆڵی تەواوی دنیای کردووە. هەر لەسەر هەمان بنچینەش خۆی بە شیاوی داهاتووش دەداتە قەڵەم. بۆیە لیبراڵە عەرەبەکان هەمیشە پێیانوایە دەبێ لەڕابردوو گوزەر بکەینو هەوڵبدەین لە ئێستای ئەورووپیدا خۆمان بدۆزینەوە. یاخود بەچاوی ئەوان سەیری ژیان بکەین. بۆیە خوێندنەوەیان دەکەوێتە دووتوێی خوێندنەوەیەکی خۆرئاوایی. یاخود مەیلێکی خۆرئاواییانە لەخۆ دەگرێت. واتە لە دووتوێی مەرجەعیەتی سیستەمی خۆرئاواییەوە تەماشای ئێستای عەرەبی دەکەن بۆیە هیچ شتێک نابینن تەنها ئەوە نەبێ کە خۆرئاوا دەیبینێت.

لێرەشدا خودی ئەو خوێندنەوەیە ڕاستەوخۆ پەیوەندی بە فیکرەی ئۆرێنتالیستەکانەوە هەیە. ئۆرێنتالیستەکانیش(١) هەمیشە خۆیان بەبێ لایەن وەسف دەکەن. واتە هەر تەنها دەیانەوێت سوود بەخشبن. واتا لیبراڵیەکان پێیانوایە لە دەرەوەی ئایدۆلۆژیاو ئیلتزامەوە دەتوانن هەوڵی گرتنی مەعریفەو چەمکەکانی بدەن. دەتوانن

بەشێوەیەکی زانستی میتۆد وەربگرن و ئایدیۆلۆژیەکەیان پاش گوێ بخەن. بەڵام لەبیریان چووە کە جیهانبینیش لەگەڵ میتۆد خۆی دەخاتە ناوەوە. ئایا دەکرێ ئەو دووانە لێکجیابکەینەوە؟

وەک دەزانین ڕونیای ئۆرینتالیستەکان لەتوێی میتۆدی فیلۆلۆژیدا(٢) هەوڵدەدا خوێندنەوەی کەلەپوور بەئەنجام بگەیێنێت. بەواتایەکی دیکە هەوڵدەدات کەلەپوری عەرەبی ئەرشیف بکات. بۆ ئەوەی لە میانی ئەرشیف کردنەدا خودی عەرەبی بخاتە دواوە. لەلایەکی دیکە ئورینتالیستەکان دەیانەوێ تێبگەن. بەڵام چ تێبگەن. بێگومان دەیانەوێ مەودای تێگەیشتنی عەرەبی بۆ کەلەپوور بزانن. چونکە وەک دەزانین عەرەب پێگەی نێوان ژیاری یۆنانو ژیاری ئێستا لەخۆ دەگرێ .

- چۆن شۆڕش پراکتیزە دەکەین... چۆن بونیادی کەلەپوور دەنێینەوە؟

ئەو دوو پرسیارەش بەیەکدادەچن و دەبنە تەوەرەی سێهەم لە گفتوگۆی ئیشکالیەتی فیکری عەرەبی. سیستەمی پەیوەندییەکانی دەگەڕێتەوە بۆ (داهاتوو - ڕابردوو) واتە چۆن دەتوانین پرۆژەی ئەو شۆڕشەی کە تاوەکو ئێستا پراکتیزە نەکراوە لەگەڵ پرۆژەی بونیادنانەوەی کەلەپوور یەکانگیر بکەین بەشێوەیەک هەریەک لە ئاستی خۆی یارمەتی ئەویدی بدات. واتە لێرەدا داوا لە شۆڕش دەکرێ کە بونیادنانی کەلەپوور بخاتە ئەستۆی خۆی، هەروەک داواش لە کەلەپوور دەکرێت کە یاریدەی بەخششەکانی شۆڕش بدات. جەدەلیەتی ئەو پەیوەندییە پەیوەستە بە فیکری هاوچەرخی عەرەبی. واتە هەمیشە فیکری چەپی عەرەبی لەناو بازنەی بۆشدا دەخولێتەوە...بۆ؟ چونکە فیکری چەپ بە بڕوای (جابری) میتۆدی جەدەلی بونیادنانی بۆ جێبەجێکردن. بەڵکو وەک میتۆدێکی جێبەجێ دەیگوازێتەوە. بەمەش دەبێت کەلەپوری ئیسلامی ڕەنگدانەوەی کێشەی چینایەتییەکانی لەخۆدا هەڵگرتبێت. هەروەک دەبێت گۆڕەپانێکیش بێت بۆ کێشەی مادییەت و میسالییەت.

بەمجۆرە کاتێک کێشەی چینایەتی فریای فیکری چەپی عەرەبی ناکەوێت. دەبێت بە (دابەزینی مێژوو) داونووسی بکەین. هەروەک کاتێک (مادییەت)یش فریای نەکەوت بە هیرێتیک (هرگقه) بەندی بکەین. بۆیە خوێندنەوەی چەپەکان بۆ کەلەپور هەمیشە دەکەوێتە

دوورتویی سەلەفیەتی مارکسییەوە هەموو ئەو خوێندنەوانەی سەرەوەش، تەنها بۆ خستنەڕووی دەرئەنجامەکانی عەقڵی عەرەبی بوو، بەمانایەکی دیکە کرێدەی عەقڵی دەخاتەڕوو. هەرکاتێکیش رەخنە بنەما مەعریفیەکانی خۆی ونکرد، ئیتر راستەوخۆ دەبێتە رەخنەیەکی ئایدیۆلۆژی بۆ ئایدۆلۆژیەت، بەو مانایەش جگە لە ئایدۆلۆژیا ناشێ شتێکی دیکە بەرهەمبهێنێ. بەڵام رەخنەی تیۆری بەرهەمهێن، یاخود کرێدەی عەقڵی دەشێ ڕێگاخۆشکەر بێت بۆ هێنانەدی خوێندنەوەی زانستیو هۆشیارانە، جا ئەگەر لەم گۆشەنیگایەی (جابری)یەوە سەیری ئەو سێ خوێندنەوانەی سەرەوە بکەین، بە کورتی دەکەوینە ژێر کارەساتی گەورەوە:- چونکە لەبارەی میتۆدەوە بەتەواوی دەکەوینە دەرەوەی بابەتو لەبارەی روئیاشەوە هەر هەموویان دوورن لە بۆچوونی مێژوویی‌یەوە.

بەمجۆرە ئەبوونی بابەتیەت و روئیای مێژوویی، فیکر دەخەنە ژێر بارێکی قورسەوە، هەر فیکرێکیش بکەوێتە ژێر ئەو بارەوە هەرگیز ناتوانێ سەربەخۆیی خۆی بپارێزێ، بۆیە بۆئەوەی ئەلتەرناتیڤێ بۆ خۆی بدۆزێتەوە، یان بۆئەوەی کەموکورتییەکانی خۆی داپۆشێ، هەوڵی گرتنی بابەتەکان دەدات تا لە شوێنی ئەو کار بکەن، واتە لە شوێنی (خود) (بابەت) دێتە قسەکردن، لەبری ئەوەی فیکر بڕیار بدات بابەتەکان یەک لەسەر ئەویدی بڕیاری خۆیان دەردەکەن.

لێرەدایە خود لە نێو بابەتدا دەتوێتەوەو بابەتیش لە شوێنی خودی ونبووندا دادەمەزرێنێ، جا بۆئەوەی بابەتیش پشت بە شتێ بدات لە سەلەف دەگەڕێ تاوەکو پشتی خۆی پێقایم بکات، یان تاوەکو لەوێوە پێوانگەکان بۆخۆی بگەڕێنێتەوە، لێرەدا دەبینین سەلەف هەموو هەر مەیلو حەزە، واتە لە عەقڵی عەرەبیدا جیاوازی نێوان ڕێبازو شەپۆلەکان هەر تەنها جۆرێکە لە سەلەف و سەلەف بەرگرییان لێدەکات. بەڵام ئایا بۆچی بەو مەیلە سەلەفییە تەواو دوای فیکری عەرەبی هاوچەرخ دەکەوێت بێگومان (جابری) دەڵێ: لە میانی ئەو خوێندنەوەیەدا سەرنجمان بۆ چەند دیاردەو هۆیەک ڕاکێشا، وەک دەشزانین خوێندنەوەی خوێندراوەکان بەشێوەیەکی میتۆدی سەختە، لەبەر ئەوەی خوێنەر بەرەو میکانیزمەکانی ئەو خوێندنەوەیە پەلکێش دەکات، دەڵێ ئەگەر تەماشای ئەو سێ خوێندنەوەیەی پێشوو بکەین، دەبینین هەرسێ خوێندنەوە، خوێندنەوەی سەلەفین و بەهیچ جۆرێک جیاوازییان بەدی ناکرێت، چونکە یەک ڕێبازی فیکری بەرهەمی هێناوە، خودی

ئەو ڕێبازەش لێتوێژەوان بە "پێوانەکردنی نادیار لەسەر دیار"(٣) ناوزەندیان کردووە. بەو مانایە هەمیشە (دیارێک) هەیە کە (نادیاری) پێ پێوانە دەکرێت. بەڵام ئایا "دیار" کامانەیە؟ بێگومان لە فیکری عەرەبیدا "دیار" هەمیشە سەربەرزییەکانی ژیاریمانی لەخۆ گرتووە. واتە هەمیشە لەسەر "ڕابردوو" داهاتوومان هەڵدەسەنگێنین .

کەواتە هەرچەندە ئەو پێوانەیە بکەوێتە دووتوێی ئایین_ ناسیۆنالیەت_ لیبرالییەت_ چەپگەرێتی... هەمیشە "دیارێک" هەیە. کە تەواوی بنەماکانی لەخۆدا هەڵگرتووە. ئەوەش هەگیز مەرج نییە بکەوێتە دووتوێی ڕێبازەکانەوە. بەمجۆرە "دیار" وەک یەکەم شەقی پرسیاری (سەربەرزی ژیاری) خۆی دەنوێنێ. بەڵام ئاخۆ میکانیزمیەتی ئەو پێوانەیە چییە؟ (جابری) دەڵێت: ئەوەی ڕاستی بێت "پێوانەکردنی نادیار لەسەر دیار" بە ڕێبازێکی زانستی دەژمێردرێتو زاناکانی زمانەوانیو فیزلۆژی ئەو ڕێبازە بۆ کارە زانیستیەکانی خۆیان بەکاردەهێنن. بەڵام خودی ئەو پێوانەیە لە زانستی ئاخاوتن بە مەحاڵ دەکەوێتەوە. واتە ئەو دەلالەتانەی لەسەر "دیار" دەکەونەوە هەرگیز دروست نابن. بەڵام فیزلۆژی بڕیارەکانی ئەو پێوانەیە بە کۆمەڵێک بڕیاری شەرعی لەقەڵەم دەدات کەواتە دەق لێرەدا (هێنانە ناوەوەی سوودو دوورکەوتنەوەیە لە زیان) هەرشتێکیش کاتێک لە دووتوێی ئەو پێوانەیە دەچێتە دەرەوە بەجۆرێکی دیکە پاساو بۆ " دیار " دەهێنێتەوە بۆ ئەوەی ڕێگای "نادیار" ی بۆ خۆشبکری . ئەگەر لە میانی ئەو لادانەش خودی ناوەڕۆک گۆڕانی بەسەردا بێت. ڕاستەوخۆ بە بارودۆخەکەیەوە بەند دەکەن .

بەمجۆرە ئەو پێوانەیە لە دووتوێی " ناناگایی" عەرەبی کاری پێدەکری. وەک وتمان ئەگەر دووچاری ئەگەرەیەکیش بێت. کۆمەڵێک پاساوی بۆ دەهێننەوە. کەواتە هەموو "ونبوونێک" بە "نادیار" دەژمێردرێت. بەومانایەش لەبەرئەوەی "داهاتوو" ونبوونێکی گەورەیەو (ڕابردوو) تەنها "زانراوێکە" بۆیە هەموو ئەو گیروگرفتانەی لە داهاتوودا بەرەو ڕوومان دەبێتەوە. دەشی لە "ڕابردووی زانراو" چارەسەرییان بۆ بدۆزینەوە. یاخود پێوانەکانیان لەوێوە بەدەست دەهێنین.

لێرەدا خودی ئەو پێوانەیە وەک بنەمایەکی (لۆژیکی / میتۆدی) زانستی عەرەبی ئیسلامی بەڕێوە دەبات و شتە نوێیەکانی پێپێوانە دەکرێت. دۆزینەوەی نوێش لەسەر ئەو بنەمایە دەکەوێتە سەر دۆزینەوە کۆنەکان. بەمجۆرە تاکو ئێستا خودی ئەو پێوانەیە

کرنەیەکی بەرهەمهێنە لە عەقڵی عەرەبیدا و کاری پێدەکرێ. بە دیوەکەی تریشەوە کۆمەڵێک سلبیاتی لە خۆدا هەڵگرتووە لەوانەش رەتکردنەوەی زەمەن و پێشکەوتن. چونکە کاتێ دەڵێین ئێستا _لەسەر ئێستاکانی رابردوو_ دەپێورێ. هەروەک ئەوە وایە کە (رابردوو _ئێستا _داهاتوو) رایەخێکی درێژکراوەو بێجوڵە بن. وەک ئەوە وایە زەمەن راوەستابێ. هەر لە خودی ئەوەشەوە نامێژوویەتی فیکری عەرەبی بەدیاردەکەوێت. هەروەک هەندێ لە روناکبیرانی عەرەب لە رێگەی رابردوو ئێستای خۆرئاواوە بیر لە ئێستاو داهاتووی عەرەب دەکەنەوە. بەوەرگرتنی "زانستو تەکنەلۆژیا" بانگەشەی لیبرالیزمی هاوچەرخ دەکەن. وەک بڵێی زانست و تەکنەلۆژیا لەدەرەوەی مێژوودا هەبن.(٤)

هەرچۆنێک بێت ئەوەی کە (جابری) تەئکیدی لێدەکاتەوە یەکلاکردنەوەی بابەتە لە خود. واتە هەرگیز ناتوانین بەهۆی (رابردوو)ی عەرەبی ئیسلامی بیر لە ئێستاو داهاتوو بکەینەوە. یاخود بە مانایەکی دیکە هەرگیز ناتوانین لەناو کەلەپوردا لە ئایندەدا بژین. بەمجۆرە پێویستە خودی ئەو پێوانەیە  بخرێتە بەر رەخنەو بەدواداچوون و شیکردنەوە. کەواتە فیکری عەرەبی نوێ، فیکرێکە لە دەرەوەی مێژوو_ لە دەرەوەی بابەت. بۆیە لێرەدا خوێندنەوەی کەلەپور خوێندنەوەیەکە لە دووتوێی سەلەفیەتەوەو هەمیشە بە چاوی رێزو ستایشەوە سەیری کەلەپور دەکرێت. ئەوەش هەرتەنها شەپۆلەکانی ئایینی ناگرێتەوە. بەڵکو تەواوی شەپۆلەکانی دیکەش دەخاتە دووتوێی خۆیەوە. بەمجۆرە عەرەب پرۆژەی رینیسانس لە رابردووەوە وەردەگرێت. جا چ رابردووی عەرەبی ئیسلامی بێ. یاخود "رابردوو_ ئێستا"ی خۆرئاوا. چ "ئەزموونی روسی"بێ. یان "چینی" واتە چالاکی فیکری لای عەرەب. هەمیشە بۆ (ئێستاو داهاتوو)ی خۆی لە چارەی ئامادە دەگەڕێت. واتە هەمیشە هەوڵدەدات گونجانێ لە نێوان (رابردوو_ئایندە) دروست بکات. جا چ رابردووی عەرەبی ئیسلامی بێ. کە وێنە هەرە دیارەکەی لە کەلەپوردایە. ئایندەی عەرەبیش کە وێنەی هەرە دیارەکەی لە زانستو تەکنیکی دەزگاکانی خۆرئاوادا خۆیدەنوێنێ. لێرەدا هەرگیز بیر لەوە ناکەنەوە کە خاڵی گونجان. مێژوو .رادەگرێ و پەرەسەندن دەسڕێتەوە. خاڵی گونجان "خودو بابەت" تێکەڵ یەک دەکات.

پرسیاری (جابری) لە کەلەپور. پرسیاری ئەوەستانە. داگرتنی کەلەپورە لە "مەیدانی عەقڵ"ەوە بۆ "مەیدانی واقیع" لە وێناکردنی نموونەییەوە بۆ پەرەسەندی مێژوویی. یەکەم

هەنگاوی ئەو ڕێگایەش بریتییە لە سەرلەنوێ خوێندنەوەی ئەو کەلەپورەو هەڵسەنگاندنی لەبەر تیشکی واقیعی بەرهەمهاتوو. مەسەلەکە ئەوە نییە کام هەوڵ بۆ خوێندنەوە دەگونجێ تاکو هەڵیبژێرین. یاخود کام میتۆدی ئامادە بەکاربهێنین. بەڵکو وەک وتمان پشکنینی ئەو عەقڵەیە کە دەیەوێت خوێندنەوە ئەنجام بدات. مەسەلەی سەرەکی ڕەخنەگرتنە لەو عەقڵە نەک بەکارهێنانی بەو ڕێگەیە یان ڕێگەیەکی دیکە. عەقڵی عەرەبی لە پێکهاتەکانیدا کۆمەڵێک ڕەگەز بەشداری تیا دەکەن لە سەرووشیانەوە پرۆسیسەکردنی تیۆری ـپرۆسیسەکردنی میتۆدی کە سینتاکسیـ فیۆلۆژی(٥)ـ ناخاوتنی لە خۆدەگرت. ئەوانەش لە (سەدەی داڕماندا) شێوازێک بوون بۆ پێوانەکردنی "ئامیار" لەسەر "دیار". بینەوەی مەرجەکانی پێوانەی زانستی پەیڕەو بکەن. بەمجۆرە خودی ئەو پێوانەیە بە شێوەیەکی میکانیکی وەک پێوانەیەکی نەگۆڕ بۆ عەقڵی عەرەبی خۆی خستە ڕووـ بێ ئەوەی بڕوای بە پەرەسەندی زەمەن هەبێت.

لێرەدا (جابری) پێی وایە بانگەشەکردنی نوێکردنەوە لە فیکری عەرەبیدا قسەیەکی بۆشە هیچ دەرئەنجامێک لەخۆ ناگرێت. بۆیە پێش هەموو شتێ پێویستە بونیادی ئەو عەقڵە لایەرەی کە لە (سەدەی داڕمان) هاتە نێو عەقڵی عەرەبی. هەڵبوەشێنینەوەو بیپشکنین و بەشێوەیەکی زۆر ورد بیخەینە بەر لێکۆڵینەوەو ڕەخنە. دەشێ ئەو بەدوا داچوونەش لە ڕێگەی پێوانەی ناوبراوەوە بە ئەنجام بگەیەنین. بەڵام بە شێوەیەکی تیرو تەسەل. (جابری) هەوڵدەدات بڵێ کۆمەڵگا پێویستی بە پەرەسەندنو پێشکەوتنەوە هەیە. بەڵام تەنها بە ناوەوەو لە هەناوی خۆیدا پەرەدەسێنی و پێشدەکەوێ. پێویستی بە کەلتوری نوێ هەیە. بەڵام نەک بەو مانایەی کە وەک شتومەک لەدەرەوە بیهێنین لە ئامێزی ڕۆشنبیریی کۆن بە موتوربە کردن لەگەڵ ڕۆشنبیریی هاوچەرخ گەشەی پێبدەین و مامەڵەی لە تەکدا بکەین. ڕەخنەی لێبگرین و بیخوێنینەوە.

کەواتە (تازەکردنەوەی عەقڵی عەرەبی) لەو بۆچوونەوە واتە تازەکاری. دابڕینی مەعریفیانەی تەواو لەگەڵ بونیادی عەقڵی عەرەبی لەسەدەی داڕماندا. بەڵام ئایا دابڕینی مەعریفیانە مانای چییە؟ لێرەدا دابڕینی مەعریفییانە بەهیچ جۆرێ بابەتی مەعریفی ناگرێتەوە. واتە پەیوەندی بەو دیدە داشۆراوەوە نییە کە پێیوایە دەبێ کەلەپور بخرێتە مۆزەخانەوە. لە شوێنێ لەناو مێژوودا جێبهێڵێ. ڕەتکردنەوەی کەلەپور بەم شێوە میکانیکییە.

نه هه‌ڵوێستێکی زانستییه، نه‌مێژوویی، ده‌شێ خودی ئه‌و هه‌ڵوێسته ده‌لالەت له ره‌واسیی_فیکری که‌له‌پور بکات له سه‌ده‌ی داڕماندا.

به‌و مانایه‌ش لێره‌دا دابڕینی مه‌عریفی کرده‌ی مه‌عریفی له‌خۆناگرێت "کرده‌یه‌کی باشلارییانه نییه" واته ئێمه دابڕین به‌و مانا زه‌مانه‌وانییه وه‌رناگرین به‌ڵکو ده‌مانه‌وێت بڵێین وازهێنانه له تێگه‌یشتنی که‌له‌پور به‌هۆی که‌له‌پوره‌وه. واته رزگاربوونه له ره‌واسبه‌کانی که‌له‌پور تاکو له‌ده‌ره‌وه‌ی ئه‌و ره‌واسبانه‌وه چه‌مکێکی دیکه بۆ که‌له‌پور بسازێنین. له‌سه‌رووی ئه‌و ره‌واسبانه‌شه‌وه چه‌مکی پێوانه‌یی سینتاکسی و فیلۆلۆژی و ناخاوتن. له میکانیزمه ناکرده‌ییه‌کانی خۆیاندا هه‌ڵده‌ستن به به‌ستنه‌وه‌یه‌کی میکانیکیانه‌ی بەشێک به به‌شێکی دیکه‌وه. یاخود هه‌ڵده‌ستن به هه‌ڵوه‌شانه‌وه‌ی گشت و دابڕینی به‌شه‌کانی له چوارچێوه‌ی زه‌مه‌ن _مه‌عریفه _ئایدۆلۆژیا_دا.

دابڕینی به‌شه‌کان له گشت و گواستنه‌وه‌یان بۆ (گشت)ێکی دیکه بێ ئه‌وه‌ی بابه‌تو خود بێنه ناوه‌وه ، راسته‌وخۆ ده‌لالەت له شێوانی بابه‌ت و تێوه‌گلانێکی ناناگاییانه خود ده‌کات. له زۆربه‌ی کاتیشدا هه‌ردووکیان پێکه‌وه رووده‌ده‌ن. لێره‌دا کاتی (بابه‌ت) خودی که‌له‌پوره. له‌م حاڵه‌ته‌دا ده‌رئه‌نجام ده‌بێته تێکه‌ڵبوونی خود له‌گه‌ڵ که‌له‌پوردا. تێکه‌ڵبوونی خود له‌گه‌ڵ که‌له‌پور شتێکه‌و تێکه‌ڵبوونی که‌له‌پور له‌گه‌ڵ خود شتێکی تره. که که‌له‌پور له‌خۆمان ده‌گرێ شتێکه‌و که ئێمه که‌له‌پور له‌خۆده‌گرین شتێکی تره. لێره‌دا ئه‌و دابڕانه‌ی باسمانکرد دابڕان نییه له‌گه‌ڵ که‌له‌پور، به‌ڵکو دابڕانه له‌گه‌ڵ جۆرێک له په‌یوه‌ندییه‌کان له‌گه‌ڵ که‌له‌پوردا. ئه‌و دابڕانه‌یه که له بونه‌وه‌رێکی که‌له‌پوری به‌ره‌و بونه‌وه‌رێکمان ده‌بات که خاوه‌ن که‌له‌پوره، یاخود به‌ره‌و که‌سیه‌تییه‌کمان ده‌بات که که‌له‌پور یه‌کێک له بنه‌ڕه‌تیه‌کانی دروستده‌کات. ئه‌و بنه‌ڕه‌تیه‌ی نێوانیان له ته‌واوی که‌سیتیدا. ده‌لالەت له که‌سێتی گه‌ل ده‌کات. ئه‌و گه‌له‌ی که خاوه‌ن که‌له‌پوره، به‌و مانایه که‌له‌پور بریتییه له ویژدانی نه‌ته‌وه_ئه‌و ناوێنه‌یه که نه‌ته‌وه به‌دیهێنانی مومکینه‌کانی تیا ده‌بینی(٦).

لێره‌دا گیروگرفتی میتۆد ئه‌وه نییه که ئه‌و میتۆده‌ی هه‌ڵمانبژاردووه مێژووییه یان بونیادگه‌رییه.. ره‌نگه له مه‌یدانێک ئه‌و میتۆده بکات، به‌ڵام له مه‌یدانێکی دیکه هه‌مان میتۆد نه‌کات. که‌واته کاتێک رووبه‌رووی بابه‌تێک ده‌بینه‌وه که‌خۆی وه‌ک به‌شێک له خودو خود وه‌ک به‌شێک له‌و ده‌نوێنێ بۆ نموونه: که‌له‌پور لێره‌دا گیروگرفته‌که به میتۆده‌وه به‌ند نابێ.

بەڵکو بە ئامرازەوە بەندە. ئەو ئامرازەی کەخۆی لە دابڕینی خود لە بابەتو بابەت لە خودا دەبینێتەوە. بۆئەوەی لەم دابڕانە شێوەیەکی دیکەی پەیوەندی دابمەزرێنێ. کەواتە گیروگرفتی میتۆد لێرەدا راستەوخۆ گیروگرفتی بابەتێتییە. واتە ئایا چۆن بۆخۆمان دەتوانین تێگەیشتنێکی بابەتییانە بۆ کەلەپور بسازێنین؟ (جابری) پێیوایە مەسەلەکە هەرتەنها بەبابەتەوە پەیوەست نییە، واتە هەر تەنها ئەوە نییە کە خود نەچێتە ناو بابەت (چەمکی خود لێرەدا ئارەزوو مەیل دەگەیەنێت) بەڵکو دەشێ ئەو مەسەلەیە لە دووئاستدا بخرێتە روو-:

**- ئەو ئاستەی کە خود بۆ بابەت دەچێ، بابەتێتی لێرەدا واتە دابڕینی بابەت لە خود.**

**- ئەو ئاستەی کە بابەت بۆخۆی دەچێ، واتە دابڕینی خود لە بابەت، هەروەها بەجێبەجێکردنی ئاستی دووەمەوە بەندە.**

پرسیاری (جابری) لێرەدا ئەوەیە کە ئایا لە خوێندنەوەی کەلەپوردا. بۆ خود لە بابەت دادەبڕێ؟ دەشێ بڵێین چونکە خوێنەری عەرەبی لە دووتوێی کەلەپوردا چوارچێوەی بۆ دارێژراوە. واتە کەلەپور ئەوی لە خوگرتووەو تەواوی سەربەستی و ئازادی لێسەندۆتەوە. یاخود بە مانایەکی دیکە ئەو لە ناو کەلەپوردا سەربەستیو ئازادی خۆی لەدەستداوە. لێرەدا بەیەککەیشتنی خوێنەری عەرەبی لەگەڵ کەلەپوردا لە ساتەوەختی لەدایکبوونەوە دەست پێدەکاتو هەرلەوێشەوە دەکەوێتە نێو وشەو چەمکەوە. وەک زمان بیرکردنەوە. وەک چیرۆکو ئەفسانەو خەیاڵ. بێئەوەی تۆزقاڵێ رۆحی رەخنەی تیا چەکەرە بکات. بێ ئەوەی هەرگیز رۆحی رەخنەی تیا دروست بێت. ئالێرەدایە کە نیشانەی بنەڕەتی لە هەموو ئەوشتانەدا بریتییە لە بونیادنانی ئێستاو داهاتوو لەسەر بنچینەی ئەو شتانەی لە رابردوودا بەدیهاتوون(٧).

کەواتە کاتێ خوێنەری عەرەبی بیر دەکاتەوە، ئەوا راستەوخۆ بەهۆی کەلەپورەوە بیر دەکاتەوە. واتە رونیا لەو وەردەگرێ و ئەو سەرپەرشتی بیرکردنەوەی دەکات. بەمجۆرە هەرگیز بیرکردنەوە ناچێتە دووتوێی کردەی چالاکانەی عەقڵ. بەڵکو راستەوخۆ دەلالەت لە بیرهێنانەوەی دەکات. واتە کاتێ خوێنەری عەرەبی دەقێک لە دەقەکانی کەلەپور

دەخوێنێتەوە. بە وەبیرهێنانەوە دەیخوێنێتەوە. نەک بەوەی کە کەشفی شتێکی تر بکات. یاخود کەشفی چەمکێکی دیکە بکات. راستە هەموو گەلێک بیر لە کەلەپوری خۆی دەکاتەوە. بەڵام جیاوازی گەورە لەوەدایە کە گەلی بیرلەکەلەپور دەکاتەوەو درێژی دەکاتەوە بۆ ئێستای خۆیو یاخود ئێستای بەشێک دەبێ لەو کەلەپورە تازەیەو بەردەوام پێیدا دەچێتەوەو لە مەیدانی واقیعدا رەخنەی لێدەگرێ. لەگەڵ ئەو گەلەی کە لە مەیدانی عەقڵی کەلەپوردا یاخود بە کەلەپوری بیردەکاتەوە کە لە گەشەسەندن وەستاوە. کەلەپورێ کە لە ئێستا دابراوە. واتە کەلەپور داناگرێتە نێو واقیع. بەڵکو هەر لە وێناکردنە نموونەییەکەی خۆیدا سەیری دەکات. بێ ئەوەی پیرۆزییەکەی بشێوێنێ و دەستی بۆ بەرێت. بەڵام کاتێ خوێنەری عەرەبی دەیەوێت لە دووتوێی کەلەپوردا هیواو ئاواتەکانی خۆی ببینێ. کاتێ دەیەوێت زانست و عەقڵانییەت و پێشکەوتن و هەموو ئەو شتانەی کە لە ئێستای ئەو وەنە "چ لە ئاستی واقیع. چ لە ئاستی خەون" بەرجەستەی بکات. راستەوخۆ لەکاتی خوێندنەوەدا پێش وشەکان دەکەوێت. تاکو ئەو مانایانە بدۆزێتەوە کە پێویستی پێی هەیە. بۆیە شتێ دەخوێنێتەوەو چەندان پشتگوێ دەخات. یەکێتی دەق دەشکێنێو دەلالەتەکانی خواردەکاتەوەو لەبوارە مەعریفیە مێژووییەکەی دەردەچێ. مەبەستمان ئەوەیە بڵێین خوێنەری عەرەبی لەژێر پاڵەپەستۆو پێداویستییەکانی سەردەمدا دەژیو سەردەمیش بەردەوام لەو رادەکات.

واتە تا زیاتر بەرەو تەنگیدکردنی خود بچێ. زێتر بەرەو چارەسەرکردنی سیحری گیروگرفتەکان دەچێ. بۆیە هەرچەندە کەلەپور لەخۆی بگرێ. ئەو هەوڵدەدات خۆی لەگەڵیدا بگونجێنێ تابەشێوەیەک بتوانێ ئەو بەخششانە بخوێنێتەوە. کە ئەیتوانیووە بیانخوێنێتەوە. واتە ئەو بەرلەوەی دەق وەک خۆی بخوێنێتەوە. گیروگرفتەکانی دەخوێنێتەوە لەم ئاستەدا دەبینین خوێنەری عەرەبی هەمیشە بە ئێستا بارگرانەو لە ژێر ئێستادا دەناڵێ.

کەواتە لێرەدا دابڕینی خود لەکەلەپور وەک پرۆسەیەکی پێویست خۆی دەنوێنێ. یەکەم رێگایەکە بەرەو بابەتێتیمان دەبات. میتۆدی زانستی زمانەوانی نوێ پێمان دەڵێ کە مامەڵەیەکی بابەتیانە لەگەڵ دەقدا بکەین. کورتکراوەی رێسا زێرینەکەی ئەو مامەڵەیەش ئەوەیە کە. بەرلەوەی خوێندنەوە بۆ مانا بسازێنین. زاراوە بخوێنینەوە. "زاراوە وەک رەگەزو تۆڕی پەیوەندییەکان. نەک وەک دەستەواژەیەکی سەربەخۆ". پێویستە لەو چەمکانە

رزگار بین کە کاتی خۆی بۆ کەلەپور دامەزراوە. یان لەو دارەزوانە رزگاربین کە ئێستا خەریکە دادەمەزری پێویستە هەموو "پێشینەو دارەزووەکان" بخەینە دووتوێی کەوانەوە. بۆئەوەی مانای دەق لە دووتوێی خودی دەقو پەیوەندی بەشەکانەوە بخەینە روو. بە مانایەکی دیکە ئازادکردنی خود لە هەژموونی دەقی کەلەپور. داوادەکات کە دەقی کەلەپور، کردارێکی توێکارانەی بۆ ئەنجام بدرێ.. کە بە راستی ببێتە بابەتی خودو مادەی خوێندنەوە، بەو مانایەش خود دەتوانی سەربەخۆیی و کەسێتی خۆی بپارێزی.

جابری لە سێ پرۆسەدا قسە لەم مەسەلەیە دەکات:

### ١- چارەسەری بونیادگەریانە :

بەکورتی مەسەلەکە لە بنەڕەتدا بە تەوەرەی فیکری خاوەن دەق و ئیشکالییەتەکانەوە بەندە. ئەو فیکرەی کە دەتوانێ هەموو ئاڵوگۆڕییەکان وەرگرێ و لە توێی دەقدا بۆ هەموو بزاڤو گواستنەوەکانی گشتی دەق پاساو بهێنێتەوە.

### ٢- شیکردنەوەی مێژوویی:

ئەو مەسەلەیەیان بە دووبارە دارشتنەوەی فیکری خاوەن دەقەوە بەندە. بەهەموو رەهەندە رۆشنبیریی و ئایدۆلۆژی و سیاسی و کۆمەڵایەتییەکانییەوە. خودی ئەو پەیوەستبوونە پێویستە. نەک لەبەرئەوەی دەتوانین لە میانی ئەوەوە لە چەمکی مێژووی فیکری دراسەکراو بگەین. بەڵکو بۆ هەڵبژاردنی دروستی نموونەی "بونیادگەری". مەبەستمان لە "دروستی" راستگۆیی لۆژیکی نییە " یان دژبوونەوە". چونکە هەموو ئەوانەی دەشێ لە چارەسەرکردنی بونیادگەریانە کاری پێبکەین. بەڵکو مەبەستمان "ئیمکانیەتی مێژوویە" ئەو ئیمکانیەتەی کە لە نێواندایەو دەکرێ دەق لەخۆ بگرێ. ئەگەر نەتوانێ لەخۆبیگرێ، لێرەدا دەچینە سەر ئەو ئیمکانیەتەی کە دەگوترێ. بەڵام هەمیشە وسبەی لێدەکرێ.

**٣- دەربڕینی ئایدیۆلۆژی،**

بێگومان شیکرنەوەی مێژوویی بە شێوەیەکی روت تەواو نییە تاکو تەرحی ئایدیۆلۆژی بە فریای نەگات. یاخود تاکو کەشفکردنی وەزیفەی ئایدیۆلۆژی (کۆمەڵایەتی_سیاسی) ماناکانی خۆی نەخاتە روو. کەواتە لێرەدا کەوانەکانی بونیانگەری دەکەینەوە بۆئەوەی بۆ ماناکانی بگەڕێینەوە.

لێرەدا دابڕینی کەلەپور لە خۆمان. بۆ ئەوە نییە کەوەک فەیلەسوف لێی وردببینەوە. بەڵکو بەو مانایە لەخۆمانی دادەبڕین تاوەکو بەشێوەیەکی نوێ و لە دووتویی وێنەیەکی نوێدا پەیوەندی پێوە بکەینەوە. بەڵام پرسیاری سەرەکی رەنگە ئەوەبێ ئاخۆ چۆن ئەو پەیوەندییە دەسازێنین.. وەک چۆن خوێنەر بە خوێندراوە دەگات. چۆن بەردەوام دەبێت؟

بێگومان کەلەپور هەرتەنها بەرهەمێکی مێژوویی نییە.. هەرتەنها بەرهەمێک نییە "مێژوو_کۆمەڵگا" دروستی کردبێت. بەڵکو بەخششێکی خودی مرۆڤایەتیشە بەڵام بێگومان ئەو بەخششە راستەوخۆ نەهاتۆتە ناوەوە. چونکە زۆرجار بەخششی فەردیانە. ئەو بەخششە ئازادو یاخییانە رێگای هاتنە ناوەوەیان لێدەگرێو دەکەونە پشت چوارچێوەکانی فیکرو رێگاکانی تەعبیرکردنەوە. یاخود لە پشت زمانەوە دەمێننەوە. جا بۆئەوەی بەو بەخششانە بگەین. دەبێ سنورەکانی فیکرو زمان ببڕین. ئەو سنور بڕینەش هەر تەنها بە روونبینی (حدس) دەبێ. هەر ئەو پێشبینی کردنەیە وادەکات خودی خوێنەر بە خوێندراوە بگاتو لەگەڵ ئیشکالییەتەکانیدا بژی و دڕەوشانەوەیان بگری. بەمجۆرە خودی خوێنەر لە نێو خوێندنەوەدا دەتوانی خۆی بخوێنێتەوە. بێ ئەوەی گیانی خۆی لەدەست بدات. هەروەها مەبەستمان لە (حدس) نزیکە لە مانا سۆفییەکەی و راستەوخۆ بە کەشفکردنەوە بەندەو رێگاکان دەخاتە روو پێش دەرئەنجامەکانی خودی خوێنەرو خودی خوێنراوە دەکەوێت. واتە کەشفی نەگوتراوەکان دەکات. نەک بەو مانایەی کە رەفزی لۆژیکە. بەڵکو کورتکردنەوەی دەرئەنجامەکانی لۆژیکییەت دەنوێنی. لەسەرەتادا وتمان هەموو میتۆدێ بە رونیاوە بەندە جا چ ئاشکرا بێ. چ بکەوێتە دووتویی ناوەڕۆکەوە. دەشێ بڵێین هەمیشە رونیا میتۆد دەکاتە ناوەڕۆکی خۆی و سنوری بۆ دادەڕێژێ، میتۆدیش بە رونیاوە دەوڵەمەندە. بۆئەوەی باشتر لە رونیا بگەین هەوڵدەدەین بە کورتی رەگەزەکانی رونیا بخەینە روو-:

**یەکێتی بیر.. یەکێتی ئیشکالییەتەکان،**

کاتێ لە فیکری تیۆری کۆمەڵێکی دیاریکراوو سەدەیەکی دیاریکراو دەدوێین. یەکێتییەکی نموونەییو تایبەت دروست دەکەین. کەهەموو ڕێبازەکانی تیادا دەتوێنەوە بەو مانایەش حەقیقەت وەک گشت سەیر دەکرێ. نەک وەک بەش_ بەشەکانیش جگە لە تەعبیرکردنی لایەنێکی ئەو گشتە شتێکی دیکە نین. بەمجۆرە لەهەموو جۆرەکانی فیکر دەدوێین وەک گشتێک بە تەنها. تەنها بۆخۆی دەشێ بە شێوەی (گشت) دراسەی بکەین. بەڵام ئایا کێ ئەو گشتە دادەمەزرێنێ؟ کاتێک کە یەکێتی بیر دەدوێن. مەبەستمان یەکێتی بیریاران نییە، یان یەکێتی ناسیۆنالیزمیو ئایینیو زمانەوانی. یەکێتی بابەتیانە. یان یەکێتی شوێنکات نییە، بەڵکو یەکێتی ئیشکالیەتەکانە. ڕەنگە ئەو بابەتانەی کە بیریاران پێیەوە پابەندن، یەک بابەت بێ. یان جیاوازبێ. ڕەنگە دەرئەنجامەکانیان یەک بێ. یان لێکترێک بێ_جیاواز بێ... هەموو ئەوانە لەگەڵ جیاوازیو تەباییان گرنگ نییە، چونکە ئەوانە یەکێتی فیکر دانامەزرێنن. بەڵکو ئەوەی یەکێتی فیکر دادەمەزرێنێ، یەکێتی ئیشکالییەتەکانی ئەو فیکرەیە. ئیشکالییەتیش سیستەمێکە لە پەیوەندی ناوەوەی فیکرێکی دیاریکراو، کۆمەڵێک گیروگرفتی جۆراوجۆری هاوبەندن. کە هەریەک بەتەنها ئیمکانیەتی حەلبوونیان هەیەو لەگەڵ یەک دەگونجێن. بەڵام لە بەشە تیۆریەکەدا حەلکردنیان گونجاو نییە. تەنها لە چوارچێوەی حەلی گشتیدا نەبێت کە هەموویان دەگرێتەوە.

واتە وەرگرتنی تەنها گیروگرفتێک، دەبێتە هۆی شێوانی ئەوانیتریش بەمجۆرە گرنگی گیروگرفتێک لە نێو ئیشکالیەتەکاندا تەنها هەر خۆی نییە. بەڵکو هەریەکەیان بەشدارە لە چارەسەرکردن. بۆ نموونە چارەسەرکردنی گیروگرفتی (ژن-ئافرەت) لەنێو ئیشکالییەتی ڕێنیسانی عەرەبیدا هەر تەنها ژن وەک کیانێکی دابڕاو ناگرێتەوە. بەڵکو ژن وەک ڕەگەزێک لە نێو ڕێنیسانسدا ئازادکردنی گیروگرفتێکە لە نێو گیروگرفتەکاندا. لێرد کاتێ گیروگرفتی ژن وەردەگرین بە ناچاری دەکەوینە نێو گیروگرفتی پەروەردەکردن و دیموکراسیەت و گیروگرفتی دابو نەریتو زمان.. یان بە جۆرێکی دیکە تەواوی ئیشکالییەتەکانی "ڕێنیسانس" لێرەدا کۆدەبێتەوە، هەر بەو مانایە یەکێتی بیر واتە یەکێتی ئیشکالییەتەکان. لەلایەکی دیکەش بیروباوەڕی جۆراوجۆر مەرج نییە ئیشکالییەتی

جۆراوجۆر بخاتەوە. دەشێ لەیەک ئیشکالیەتدا کۆمەڵێک بیروڕای جیاواز هەبێت، لەلایەکی دیکەش ئیشکالیەت بەشوێنکاتەوە بەند نییە. بەڵکو بەکراوەیی دەمێنێتەوە.

## مێژوویێتی بیر.. بواری مەعریفی و ناوەڕۆکی ئایدیۆلۆژی،

ئەو سەرنجانەی پێشوو بەرەو لۆژیکی دووەممان دەبات ئەویش مێژوویێتی بیرە، مێژوویێتی بیریش پەیوەستە بەبارە سیاسیو کۆمەڵایەتیو ئابووریو رۆشنبیرییەکان چونکە بیر لەم بوارانەدا دەجوڵێتەوە. لە پێشەوە وتمان ئیشکالیەتە فیکرییەکان بە شوێنکاتەوە بەند نین، واتە دەشێ هەر بیریارێک تیایدا بیربکاتەوەو بە دوایاندا بچێ. چونکە پەیوەندییەکانی فیکر بە واقیع و ئینجا مێژوو، کە تائێستا تەجاوز نەکراونو بەردەوامن. پەیوەندگەلێکی ئاڵۆزن. بەڵام نەک بەو مانایەی کە توانای شیکردنەوەیان نەبێت. بەڵکو لەبەرئەوەی دەکەونە دووتوێی چوارچێوەکاری ئامادەو ئاوای هاوگونجانی شیکردنەوەو ئامرازەکانی شیکردنەوە دەکەن. بە شێوەیەک کە توانای وەرگرتنی ئەو فیکرەی هەبێت. بواری مێژووی بیر وەک پێویست قۆناغە بەدوایەکدا هاتووەکانی دەوڵەتو پەرەسەندنی ئابووریو جەنگەکان.. هتد وەک پێوانەیەک بۆ دیاریکردن لەخۆ ناگرێت. چونکە فیکر سەریان بۆ دانانوێنێ. بەڵکو ئەو ئەو سەربەخۆییە رێژەییەی کە فیکر باڵی تیا لێکدەدات " لە زۆرینەی جاردا بەرفراوانە" وا دەکات بەرەو پێکهاتەکانی خودی فیکر بگەڕێینەوە تاکو لەوێوە بواری مێژووی فیکر دیاریبکەین. ئەوەی لێرەدا بە بواری مێژوویی ناودەبرێت دەشێ بە "تەمەنی ئیشکالیەتەکان " تەعبیری لێبکەین.

**بواری مێژوویی هەر فیکرێکیش بە دوو شت دیاریدەکرێت،**

١- **بواری مەعریفی،** ئەو بوارەی کە هەمان فیکر تیایدا دەجوڵێتەوەو لەیەک جۆری هاوگونجاوی "ماوەی مەعریفە" پێکهاتووەو دەکەوێتە سەر ئامرازی بیرکردنەوە وەک: چەمک، تەسەورات، بۆچوون، میتۆد.

٢- **ناوەڕۆکی ئایدیۆلۆژی،** کە ئەو فیکرەی لە خۆیدا هەڵگرتووە. یاخود ئەو وەزیفە سیاسیو کۆمەڵایەتییەی کە خاوەن بیر بەو مادە مەعریفییەی دەبەخشێ. بۆئەوەی جۆری پەیوەندییەکانی نێوان ئەو دووانە لە بواری مێژوویی فیکرێکی دیاریکراو دەستنیشان بکەین، پاشان بۆ جۆری ئەو پەیوەندییانەی کە لە نێوان فیکرو واقیعدا هەیە. دەبێ دروست بزانین کە ئەو ئیشکالیەتیە تیۆرییەی کە یەکێتی ئەو فیکرەی لەسەر بونیادنراوە لە بنەڕەتدا ئیشکالیەتێکی مەعریفییە. واتە لە دەرەنجامی ململانێی بوارێکی مەعریفییەوە هاتۆتە ئاراوە. هەر بەهەمان شێوەش دەمێنێتەوە تا مەرجە مایو ئەبیستمۆلۆژییەکەی ئەو بوارە مەعریفییەی بەرهەمی هێناوە، راوەستابێ، بەڵام ناوەڕۆکە ئایدیۆلۆژییەکانی کە ئەو مادە تەوزیفی دەکا، دەکەوێتە هەمان بواری مەعریفیو هەمان ئیشکالیەتەوە کەچی ناکەوێتە نێو ململانێ مەعریفیەکان، بەڵکو بە ململانێی ئایدیۆلۆژییەکانەوە بەندە. سەرچاوەو بنەماشی بەپلەی پێشکەوتنە مەعریفییەکانەوە بەند نییە، بەڵکو بە قۆناغە تەجاوزکراوەکانی پێشکەوتنی کۆمەڵایەتییەوە بەندە.

بەمجۆرە ئەو ناوەڕۆکە ئایدیۆلۆژی و مەعریفییەی کە فیکرێکی دیاریکراو لەخۆیدا هەڵیگرتووە ناکەوێتە سەر یەک پلەی پێشکەوتن، بەڵکو لە زۆربەی بارەکاندا یەکێکیان پێشکەوتووەو ئەویتریان دواکەوتووە. بە دەستەواژەیەکیتر پابەندبوون بەهەمان ئیشکالیەت و هەمان بواری مەعریفی تێوەگلانی هەمان ئایدیۆلۆژیا ناگەیەنێت. هەروەها تەوزیفکردنی ئەو مادە مەعریفیە کە بواری مەعریفی، پێشکەشی دەکات، بۆ مەبەستی تاکە ئایدیۆلۆژیایەک نییە، بەڵکو ئەوەی کە لە زۆربەی بارەکاندا دێتە بەرهەم هەڵگری سیستەمێکی مەعریفییە، بەڵکو تاکە فیکرەیەکە لە دووتوێی ناوەڕۆکی ئایدیۆلۆژی جۆراوجۆرادا .کەواتە ناشێ وەک پێداویستیەکی (میتۆدی) ناوەڕۆکی مەعریفی و ناوەڕۆکی

ئایدیۆلۆژی لە دووتوێی فیکرێکی دیاریکراودا لەیەک جیابکەینەوە. بەڵکو ئەوە واقیعی فیکری فەلسەفی ئیسلامییە ئەو شتەمان بەسەردا فەرز دەکات. فەیلەسوفانی ئیسلامی تەنیا یەک ئیشکالیەتی تیۆرییان چارەسەرکرد ئەویش بە رێکەوتنی (عەقڵ و نەقڵ) ناوەزەندیان کرد. ئەو رێکەوتنەش لەگەڵ "موعتەزیلەکان" هاتە ناوەوەو لەگەڵ قوتابخانەی مەشرق و (ئیبن سینا) درێژەی پێخۆیدا. هەروەها بونیادی فیکری "زانستی" یۆنانیو بونیادی فیکری ئاینی "ئیسلامی" تێکەڵکرا بەو ئیعتیبارەی کە یەکەم نوێنەرایەتی بۆچوونی عەقڵی "زانستی" بۆ مرۆڤ و گەردوون دەکات. دووەمیش حەقیقەتی "رەها"ی لەخۆدا هەڵگرتووەو دەلالەت لە ئاسنامەی یان شوناسی ژیاری دەکات. ئەوەش وادەگەیەنێت کە بواری داهێنان لەبەرامبەر فەلسەفەی ئیسلامیدا بوارێکی زۆر دیاریکراوە. واتە ناشێ ئەوانەی کە دێن پێشینەی خۆیان لە پێناو تەواوکردن و تەجاوزکردن بخوێننەوە. بە واتایەکی دیکە ئەوەی فەلسەفەی ئیسلامی بانگەشەی دەکات خوێندنەوەی یەک لەدوای یەکو نوێکردنەوەی بەردەوامی مێژووی تایبەت نییە. وەک چۆن لە فەلسەفەی یۆناندا دەبینرێت. یان هەروەک لە "دیکارت"ەوە تا ئەمڕۆ. لە فەلسەفەی ئەوروپی بەرچاومان دەکەوێت. بەڵکو فەلسەفە لە ئیسلامدا پێکهاتووە لە خوێندنەوەی سەربەخۆییانەی فەلسەفەکانی دیکە "واتە فەلسەفەی یۆنانی" خوێندنەوەیەک کە هەمان ماددەی مەعریفی بۆ ئامانجی ئایدیۆلۆژی جۆراوجۆری لە یەکدوور لەخۆدەگرێت. لای (جابری) گەورەترین ئیشکالییەت کە فەیلەسوف و مێژوونووسانی کۆن و نوێ و ئۆرێنتالیست و هاونیشتمانی عەرەبی تێیکەوتوون ئەوەیە کە هەمیشە لە گۆشەیەکی مەعریفی برەوبارەوە سەیری فەلسەفە دەکەن. بۆیە زیندوێتی مێژوو پێشکەوتنی تیادا بەدی ناکرێ .

لەولاشەوە ئەوانەی خۆیان بە نوێکار لە قەڵەم دەدەنو دەیانەوێ تەجاوزی کۆنەکان بکەن. دەکەونە بەکارهێنانی "میتۆدێکی جێبەجێکراو" نەک میتۆدێ بۆ جێبەجێکردن "وەک لە پێشەوە قسەمان لێکرد" ئەوەش وەک ئەوە وایە کە فەلسەفەی ئیسلامی دووبارەکەرەوەی هێڵە گشتییەکانی فەلسەفەی مرۆڤایەتی بێت. بەمجۆرەش تایبەتێتی لە نێو گشتیدا بە تەواوی دەتوێتەوە. جگە لە دروستی "میتۆدی جێبەجێکراو" هیچ شتێکی دیکە ناگەیەنێت.

واتە هەموو هەڵەکانی مێژووی فەلسەفەی ئیسلامی لە تێکەڵکردنی ناوەرۆکی مەعریفی برەوبارو ئەو ناوەرۆکە ئایدیۆلۆژییەدایە کە هەڵیگرتووە. جا لەبەرئەوەی ناوەرۆکی

مەعریفی دراوی راستەوخۆیەو. بە شێوەیەکی راستەوخۆش لە فەلسەفەی یۆنان و زانستەکەیەوە هەڵقولاوە. بۆیە لە دەرئەنجامدا زیندەگی لە فیکری فەلسەفەی ئیسلامیدا دووچاری کوشتن دێت. ئەو بەخششانەی کە پێشکەشی دەکات شێوەیەکی لێلاوی "ئەسڵی" یۆنانی، یان مرۆیی دەبێ. ئەوانەی دەیانەوێ لەو شێوە لێلاویەدا دەست بۆ پێشکەوتن بەرن، بەپێی ئەو چوارچێوە ئامادەیەی کە پێیەوە پابەندنو لەسەر ئەو بنەرەتە دەیانەوێ واقیع جیابکەنەوە، دووچاری پەشێوی جیاکردنەوە دێن.

لە فەلسەفەی یۆنانیدا ناوەڕۆکی مەعریفی و ناوەڕۆکی ئایدیۆلۆژی لە رستەیەکدا بەیەکەوە گەشە دەکەن. یەکەمیان بەهۆی پێشکەوتنی زانستی و دووەمیان بەهۆی پێشکەوتنی کۆمەلایەتی. هەروەک چۆن زۆر بە روونیش لە فەلسەفەی ئەوروپیدا دەبینرێت. کەچی لە ئیسلامو مەسیحییەتی (سەدەی ناوەڕاستدا) فەلسەفە هەر ئەوەیە کە هەیە. ئەوەی کە دەگۆڕێت هەرتەنها ئایدیۆلۆژیایە. بەپێی بەرژەوەندییەکانی خۆیەوە دەست بەسەر مادەی مەعریفەدا دەگرێت. کەواتە زانست لە ژیاری ئیسلامدا هیچ جۆرە پێشکەوتنێکی بەخۆوە نەبینیووە. هەموو ئەو هەنگاوانەی بۆ (بیرکاری) لەگەڵ (الخوارزمی)و (الکرخی)و (السموال) دران. هەموو ئەو پێشکەوتنەی کە لە رووی (زانستی فەلەک) لەگەڵ (البیاتی)و هەموو ئەو بەخششانەی کە (الرازی و ئیبن سینا) لە زانستی پزیشکی پێشکەشیان کرد.. ئەگەرچی بە هیچ شێوەیەک ناکرێ لە گرنگی ئەو هەنگاوانە کەمبکەینەوە. بەلام لەگەڵ ئەوەش هەموو ئەو هەنگاوانە نەیانتوانی گۆڕانێک بەسەر بۆچوونی فەلسەفەو سیستەمی باوردا بهێنن. کەواتە ئەوەی کە فەلسەفەی ئیسلامی لای گرنگە تەسەوراتی نوێ نییە. بەڵکو ئەوەیە کەعەوڵ بدرێت تەسەوری ئایینی لەلایەن عەقڵەوە بەپەسەند بزانرێ. هەروەک چۆن تەسەوری عەقڵیش رەوایەتی خۆی لە بۆچوونی ئاییندا بەئەنجام بگەیەنێت .

لێرەدا لەبەرئەوەی وەک گوتمان رستەکانی مەعریفی یەک رستەی دڕێژن. بۆیە ئەگەر بمانەوێت شتە نوێیەکان لە نێو فیکری ئیسلامیدا بەرجەستە بکەین دەبێ راستەوخۆ بۆ وەزیفەی ئایدیۆلۆژی بگەڕێینەوە.

(1)

جابری دەڵێ، بڕواناکەم لە تەواوی مێژووی مرۆییدا فیکرێک هەبێت هەمیشە لە موعاناتدا بخولێتەوە. یاخود وەک فیکری فەلسەفی ئیسلام هەمیشە لە ژێر ستەمی مێژوونووساندا بناڵێنێ لێرەدا دەبێ پەنجە بۆ ئەو مێژوونووسە کۆنانە رابێرین کە هەمیشە لەڕێی هێنانی شتومەکی بێگانە "زانست" راوەستابوون و هەتا ئێستاش هەندێ لە توێی هەمان چوارچێوەدا بیردەکەنەوە. بەڵام ئۆرێنتالیستەکانو قوتابیە عەرەبییەکان پێیانوایە کە فەلسەفەی عەرەبی ئیسلامی درێژکراوەی فەلسەفەی یۆنانییە لەسەدەی هیلینستیدا. وەک جەستەیەکی نامۆ لە کۆمەڵگای عەرەبی ئیسلامیدا سەیری دەکەن. هەروەها بیریارە چەپەکانیش هەروەک لە پێشەوە باسمانکرد لە دووتوێی چوارچێوە ئامادەکانەوە جارێک لە ململانێی چینایەتی دەدوێنو جارێک لە (دارمانی مێژوو)و جارێکی دیکەش باس لە ململانێی "مادییەت"و "میسالیەت" دەکەن.

وەک گوتمان هەموو ئەوانەش دابڕینی فیکری ئیسلامییە لە کەشی رۆشنبیریی و سیاسی و کۆمەڵایەتی.. خۆی و دواجار شێوانی شوناس و وەزیفەی شوناس و گۆڕینی "تحریف" هەنگاوەکانی پێشکەوتنی ئەو شوناسە دەگەیەنێت. لێرەدا راستکردنەوەی ئەو ناگایە مێژووییە داوا دەکات کە "شتەکان لە سەرچاوەی خۆیەوە تەماشا بکەین" لە دووتوێی هەمان مێژوودا لێی بڕوانین. لە دووتوێی ئەو شتانەی کە دەبێ دووبارە چاوی پێدا بخشێنینەوە. ئەو تەسەوراتە نامێژووییە کە لەگەڵ ناگایی عەرەبی گونجاوەو ئێستاش لەگەڵیدا دەڕواو مێژوومکەشی بە مێژووی بەشەکانی دەژمێرێ، نەک هەموو مێژوو. ئەو تەسەورە هەموو "بەشەکان" مێژووی عەرەبی دووچاری زیان کردوە. بۆیە فەلسەفەی ئیسلامی عەرەبی تا ئێستاش "مێژووەکەی" لەدەرەوەی ئەو مێژووەوە دەنوسرێ کە پابەندێتیو بەشدارە لە دروستکردنیدا گێرەدا دەشێ بۆ ئیشکالیەتی نافرەت لەسەدەی رێنیسانسی عەرەبیدا وەک بەشێک لە گشتدا بگەڕێینەوە ."

ئەگەر لە میانی ئەو وەزیفانەی کە لە نێو گشتدا. یان لە نێو ململانێی و کێشەکانی کۆمەڵگای سەردەمدا تەماشای فەلسەفەی عەرەبی ئیسلامی بکەین ئایدیۆلۆژیەتێکی شۆڕشگێڕانە خۆیدەخاتە روو، کە خۆی بۆ خزمەتکردنی زانست و پێشکەوتن و

پەرەسەندنی داناوە. ئەوەش ئەوە دەگەیەنێت کە دژی کۆنە پەرستییە. یان دژی ئەو رەگەزانەیە کە بەرژەوەندی خۆی لە بەرژەوەندییە ناسیۆنالیزمی و بەرژەوەندییە چینایەتیەکەدا "واتە ئاوڕدانەوەی دواوە. لە دووتوێی مێژوودا" دەبینێتەوە.

ئەگەر خودی ئەو مەسەلەیە بە تەرجەمەکردنی سەردەمی عەباسی بەراورد بکەین. زۆر بە روونی بۆمان دەردەکەوێت کە پرۆسەی تەرجەمەکردن پرۆسەیەکی بێلایەن نەبووە. پرۆسەیەکی رۆشنبیری نەبووە لە پێناو پەرەسەندن. بەڵکو بە پێچەوانەوە بەشێکی سەرەکی ستراتیژییەتی گشتی لەخۆ گرتووە کە دەوڵەتی نوێ ئاراستەکانی دەکێشا. "دەولەتی عەباسی هێزە دوژمنکارەکانی ئەو" لەسەرووی هەموشیانەوە دەلالەتی ئەو ڕووە ئایدیۆلۆژییە دەکرد کە لە ڕووە کۆمەڵایەتیو سیاسییەکاندا فەشەلی هێنابوو لێرەدا ئۆرستۆکراتیەتی فارسی دەرکی بەوەکرد. کە دەسەڵات لە کۆمەڵگای ئیسلامی ئەوسا بەپلەی یەکەم ئایدیۆلۆژیا ئاراستەکانی دیاریدەکات. ئایدیۆلۆژیاش "لێرەدا ئایینی ئیسلام دەگرێتەوە" هێزی مادی دروستی دەکات. ئەو هێزەش دەتوانێ لە کێشەو ململانێی خێڵەکیانەو چینایەتی کەمبکاتەوەو بیخاتە دەرەوەی خۆی. بۆیە بڕیاریدا چەکی خۆی کە لە کەلەپوری رۆشنبیریو ئایینی غنوسیەت(٧) بونیادنرابوو" واتە بڕواهێنان بەسەرچاوەیەکی دیکە بۆ مەعریفەت لە دەرەوە عەقڵ کە ئەویش "عیرفانە. یان ئیلهامی خودایییەو لەدەرەوەی سروشو لەدەرەوەی عەقڵ و نەقڵ دایە" بەکار بخات.

بەمجۆرە ئۆرستۆکراتیەتی فارسی بە شێوەیەکی بەرفراوان لە دووتوێی بەکارهێنانی کەلەپوری رۆشنبیریو ئایینی "زەردەشت و مانەوییەت و مزدەکییەت" هێرشە ئایدیۆلۆژیاخوازەکەی خۆی خستە گەڕ. ئامانجی سەرەکی ئەو هێرشەش دروستکردنی گومانو هەڵوەشاندنەوەی ئایینی عەرەبی بوو. تاکو لە وێوە بتوانێ دەسەڵاتی عەرەبیو دەوڵەتی عەرەبی ملکەچ بکات. بەڵام دەوڵەتی عەباسی کە تازە خۆی دەگرت. لەبەرامبەر ئەو هێرشانە هانی موعتەزیلەکانی داو رێبازەکەی ئەوانی پەسەندکرد لەلایەکی دیکەش لە رێگەی تەرجەمەکردنی کتێبە فەلسەفییەکانی "یۆنان"و خستنەرووی ناوەڕۆکیانەوە هەوڵیدا بەرامبەر ئەو هێرشە بووەستی. بۆیە گەرچی خەونی "مەئمون" حەقیقی بێ. یان دروستکراو خەونێکی بەرینانە نەبووە. واتە لە پێناو "ئەرستۆ" دانەبووە. بەڵکو بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی (زەردەشتییەتو مانییەت) بوو. لەبەر ئەوەی ئەهلی سوونە دژی موعتەزیلەکان بوون. بۆیە

ئەو هاندانو پەسەندکردنەی دەوڵەتیان لەدڵگران بوو. رقو کینەی ئەهلی دەقییان وروژاند. بەمجۆرە دەبینین فەلسەفە لە بەرامبەر ناراستەکردنی دوو دوژمنی توندا: غنوسیەت "کەپاشان تەسەوفی لێکەوتەوە" ئەهلی سوننەو فوقەها دووچاری پەشێوی بوو. بەڵام موعتەزیلەکان توانای ئەوەیان هەبوو کە بە لۆژیکی "جەدەلی" ئەو لۆژیکەی کە پشتی بە "پێوانە نادیاری لەسەر دیار " دەبەستا. دژی هێرشەکانی غنوسیەتی خاوەن "عیرفان" بوەستن.

لێرەدا بێ ئەوەی درێژە بەو مەسەلەیە بدەینو دواجار کودەتای "ئەهلی سوننە" لە دژی "موعتەزیلەکان" لەسەردەمی "موتەوەکیل" بخەینە بەر باسو لێکۆڵینەوە. هەوڵدەدەین بڵێین فەلسەفە لە کۆمەڵگای ئیسلامیدا هەرگیز وەک لایەنێکی فیکری بەشدارینەکردووە بەڵکو هەمیشە وەک گوتارێکی ئایدیۆلۆژی شۆڕشگێڕانە خۆی نواندووە. بۆ نمونەش دەتوانین بڵێین "کیندی" یەکەم فەیلەسوف بووە کە بە شێوەیەکی راستەوخۆ چۆتە نێو کێشە ئایدیۆلۆژیەکانەوە "کێشەی نێوان موعتەزیلەو غنوسەو ئەهلی سوننە" بەتەواوی لایەنگیری موعتەزیلەکانی دەکرد.

"کیندی" جۆرە هاوسەنگیەکی خستە نێوان ئاینو فەلسەفە. وای لە هەردووکیان کرد کە بە شێوەیەکی هاورێکو گونجاو بەرەو یەک ئامانج ببینەوە کە ئەویش "راستییە" ئینجا "فارابی" دوای کودەتای سوننەو لە ساتەوەختی کودەتاکانی "بویهییەکان_ حمدانییەکان"ی شیعە بەسەر سوننەدا. هاتە ئاوەوە. ئەوساتە ئیمپراتۆرییەتی عەرەبی بۆ کۆمەڵێک دەوڵەتی بچوک بچوکو پرکێشەی ئایدیۆلۆژی هەڵوەشایەوە. بۆیە هەمیشە "فارابی" بانگەشەی یەکبوونی فیکری دەکردو گوتاری "عەقڵی گەردوونی" راگەیاند کە هیچ جیاوازییەک لە نێوان ئاینو فەلسەفەدا بەدیناکات. تەنها لە رێگەی تەعبیرکردنەوە نەبێت واتە یەکەم: شێوازی جەدەلیەت پەیڕەو دەکات. دووەمیش بورهانیەت. بەمجۆرە "فارابی" وێنەیەکی خستەڕوو. کە نە گۆشەگیربوو. نە دابڕاو لە دنیا. هەمیشە بڕوای بە پێشکەوتن و توانای عەقڵی هەبوو. واتە پرۆژەی "فارابی" پرۆژەیەکی ئایدیۆلۆژی بوو. لە پێناو دووبارە گەڕانەوەی یەکێتی بۆ کۆمەڵگا. فەلسەفەو زانستی لە پێناو ئەو یەکێتییە بەکاردەهێنا.

بەڵام "ئیبن سینا" کە ماوەی ژیانی دەکەوێتە دووتوێی پارچەپارچەبوونی ئیمپراتۆرییەتی عەرەبیو شوێنکەشی باوەشی وڵاتانی فارس بوو. لە کەشو هەوای کێشەو

ململانێی رۆشنبیریو زانستی نێوان مەشرق "واتە ئەهلی خوراسان و هۆزەکانیان "لەگەڵ مەغریب" واتە ئەهلی عێراقو شام" سەری هەڵێنا.

راستە "ئیبن سینا" سیستەمی گریمانەییەکەی "فارابی" پەیڕەودەکرد. بەڵام ئەک بو ئەوەی لە دووتوێی کۆمەڵگاو مێژوودا بەکاری بهێنێ. ئەگەرچی لە شێوەی خەونیشدا بێت. وەک چۆن "فارابی" پرۆژەکانی خۆی لەسەر دامەزراند. بەڵکو ئەو بۆئەوەی بوو کە تاقێک بەرەو ئاسمان بەرێت. تاڵەوێدا رۆحی بێجەستەی ئەو شوێنێی لە "دنیا" بەر لە" ئاخیرەت" داگیر بکات.

لێرەدا جابری دەڵێت "ئیبن سینا" دوو رووی هەبوو. کتێبی "الشفاء"و کتێبی "النجاة". ئەو رووەی کە لە "النجاة" دەیکێشێ روویەکی تاریکی غنوسیەتەو راستەوخۆ پێچەوانەی "الشفاو" دەکەوێتەوە. واتە "ئیبن سینا"هەمیشە لە هەوڵی بەرجەستەکردنی رێبازی رۆحی غنوسیەتدا بوو. بۆیە پێویستە ئەو وێنەیەی کە "الشفاو" بۆی کێشاوە لە ئاگایی (عەرەبیدا) راستی بکەینەوە. چونکە تاکو ئێستاش رووە (مەشریقیەکەی) "ئیبن سینا" وەک هەڵگری "ئەسالەتی ناسیۆنالیزمی" فارسی درێژەی هەیە . واتە لە بازنەی فەلسەفەی عەرەبی چوتە دەرەوە. بەڵام لە مەغریبی عەرەبیدا فەلسەفەی ئیسلامی "ئابڕانی" لەگەڵ ئیشکالیەتە مەشریقییەکە دروستکرد. واتە ئیشکالیەتی مەغریبی "لەوپەڕی مەغریبی ئەندەلوسدا"و لەوێشەوە بەهەمان شێوە. فەلسەفە لە پێناو عەقڵ و عەقڵانییەتدا درێژەی بە خۆیدا. بەڵام نەک بەهەمان شێوەی "مەشریقی" بەڵکو دووبارە خۆی لە ناوەوەو بە میتۆدی نوێو نوێو لە ئاسۆی نوێوە خستەڕوو. لەگەڵ "شۆڕشی رۆشنبیری" کە "ئیبن تومرت" بەرپایکردبوو. گەیشتنە یەک.

ئێمە لێرەدا ئامانەوێ خوێندنەوەو رەخنەی "مەغریبی" لە "مەشریق"و "ئیبن باجە"و "ئیبن تفیل" لە "ئیبن سینا" دووبارە بخەینە بەرچاو. هەروەها ئامانەوێت "ئارمانشاری" فارابی وەک "ئیبن باجە" لە درک خاڵی بکەین. چونکە لێرەدا "ئیبن باجە" وەک واقیعێک لە خەونەکانی (فارابی) دەڕوانێ و لە داهاتووی خەونەکەیدا دەژی و پێی وابوو دواجار درکەکان دەبنە هۆی شێوانی "ئەرمانشار" واتە ئاشێ گوڵەکان بەهۆی زەمەنەوە درکەکان چاک بکەن. بەڵکو پێیوابوو ئەو درکانە گوڵەکان تووشی ئامۆیی دەکەن. بەکورتی هەر لە سەرەتاوە فەلسەفەی (مەغریبی) لەسەر رەتکردنەوەی فەلسەفەی (مەشریقی) خۆی دامەزراند.

واتە ئەگەر چی "ئیبن باجە" ئاگایی (فارابی) دووبارە دەکاتەوە، بەلام بە رۆحێکی رەخنەگرانە تێیمڕوانێ. هەروەها لە فەلسەفەی (مەغریبی) پێی وایە باروبۆخەکە هەمان باروبۆخی پێشوو نین. هەروەها ئیشکالیەتەکانیش هەمان ئیشکالیەت نین.

بۆیە حیکمەتی ئەو ئەزموونە فاشیلەی (مەشریقییەکان) کە پشتی بە دەسەڵاتی "فیقهە"و هێزی کۆنە پەرستو پارێزگار دەبەستا. ناشێ دووبارە بکرێتەوە، واتە هەوڵی واقیعێکی نوێیان دەدا. پێیانوابوو "ئەوەی لە ئایین دایە، نموونەی ئەوانە نین کە لە فەلسەفەدان"و ناکرێ تێکەڵ یەکتریان بکەین. هەموو ئەو شتانەی کە دەشێ بکرێ و بە ئەرکی فەلسەفە دەزانرێ، ئەوەیە کە دووبارە پەیوەندی نێوان فەلسەفەو ئایین بنێتەوە، لێرەدا "ئیبن روشد" بەدیاردەکەوێ کە دەڵێ نابێ حەق دژی حەق بکرێتەوە، بەڵکو دەبێ حەق دانی پێدابنرێ و گەواهی لەسەر بدرێت. فەلسەفەی "مەشریقی" لەسەر (پێوانەی ئادیار لەسەر دیار) خۆی بونیادنا، سیفاتی خوایی بە سیفاتی مرۆڤ پێوانە کرد، واتە لێرەدا هەم رێگایان هەڵە بوو، هەم ئامانج.

بەکورتی فەلسەفەو ئایین ناشێ تێکەڵی یەکتر بکرێن، چونکە هەریەکەیان پرینسیپ و سەرەتاکانی خۆی هەیە، دەکرێ هەریەک لە ئاستی خۆی پەرەی پێبدرێ، تائەو کاتەی عەقڵ ئامادەیی خۆی لە ئاییندا دەنوێنێ، هەروەک چۆن فەلسەفەش دەرک بە ئایین دەکات. بەمجۆرەش هەردوکیان بەرەو حەقیقەتو بەرەو موتڵەق دەبنەوەو دواجار لە ئاکۆتاییدا تێکەڵ یەکتر دەبن. کەواتە خاڵی سەرەتا لەم پرۆژەیەدا ئازادکردنی فەلسەفەیە "فەلسەفەی ئەرستۆ بەو مانایەی کە تەواوترین فەلسەفەیە "لە هەڵەو تەئویلی خواروخێچ، بۆئەوەی بۆ ئەسڵەکەی بگەڕێینەوەو خوێندنەوەی ئەرستۆ بە ئەرستۆ ئەنجام بدەین. هەر بەو مانایەش دەتوانین چارەسەری پەیوەندییەکانی ئایین و فەلسەفە بە شێوەیەکی عەقڵانی و واقیعی بەئەنجام بگەیەنین. کە هەریەک لەوان شوناسی خۆی هەیەو هەردوکیشیان دوای توێژینەوەی حەقیقەت کەوتوون. ئەوەش ئەو واقیعەیە کە رەخنەی (ئیبن روشد)ی لێهەڵقوڵاوەو دەشێ بە درێژکراوەی حەزەکانی (ئیبن باجە)و (ئیبن تەفیل)یان بژمێرین، بەڵام ئاخۆ گوتاری "روشد"ی خەونە (واقیعی)یەکەی بەجێهێنا؟

دەشێ بڵێین ئەوەی کە دوای گواستنەوەی "ئیبن روشد" بۆ ئەورووپا، لە وڵاتی "مەغریبو ئەندەلوس" مایەوە، هەرتەنها "ئیبن خەلدون" لە "مقدمە"کەی خۆیدا پارێزگاری

لێکرد. جا بە ڕاستی "مقدمەی "ئیبن خەلدون" وانەی عەقڵە لە ئەقڵەوە، پەندو حیکمەت وەرگرتنی مێژووە لە مێژووەوە، گوتارێکە لە ڕابردووەوە بەرەو داهاتوومان دەبات. هەر لەسەر ئەو بنەڕەتەش فەلسەفە لە کۆمەڵگای عەرەبی ئیسلامیدا، نە کاڵاو شتومەکی بێگانەیە نە جەستەیەکی نامۆشە، بەڵکو ڕەنگدانەوەی گیروگرفتەکانی واقیعو خەون ئارەزووەکانی خۆی لەخۆ هەڵگرتووەو ڕاستەوخۆ لە ویژدانی ئەتەوەوە هەڵقوڵاوە.

(2)

لێرەدا مەسەلەی (مەشریقو مەغریب) بە سەپاندن و نکوڵیکردنی پەیوەندییەکانەوە بەند نییە، بەڵکو بە جۆری پەیوەندییەکانەوە بەندە. واتە کاتێ خوێندنەوە بۆ فەلسەفەی سیاسی و ئایینی (فارابی) دەکەین، هەوڵدەدەین (فارابی) بەهۆی (فارابی)یەوە بخوێنینەوە نەک (فارابی) لە نێو فەلسەفەی "ئەفلاتونو ئەرستۆ"دا بەڵام لەگەڵ خوێندنەوەی (فارابی)دا دەبینین. فەلسەفەی (یۆنان)یش دەخوێنینەوە ئەوەش بە تەواوی لەگەڵ خوێندنەوەی ئێستای (ئێمە) بە جیاواز دەکەوێتەوە. چونکە حەقیقەتی فەلسەفەی یۆنانی بەتەواوی لەگەڵ (ئێمەدا) جیاوازە. (ئێمە) هەمیشە دەبێ بەدوای خۆماندا بگەڕێین. نەک بەدوای تەئویلەکانی ئەوان. ئەو تەئویلەی کە واقیعی ئەوان بەسەرماندا دەیسەپێنێ. بۆ نموونە حەقیقەتی لیبرالی ئەورووپی بەسەدەی هەژدەوە بەندە. ناکرێ ئێستا لێرەدا بۆی بگەڕێین. کەواتە بۆچوونی ئێمە لەو سەدەیەدا لەگەڵ بۆچوونی ئەوان جیادەکەینەوە. بۆیە پێویستە دووبارە چاو بە شتەکاندا بخشێنینەوە. فارابی هات ڕای خۆی لەگەڵ "ئەرستۆو ئەفلاتون" تێکەڵکرد. ئەو هەوڵیدا ناکۆکییەکان لەو ڕێگایەوە چارەسەربکات. بەڵام "ئیبن سینا" ئەو دوو فەلسەفەیەی بە شێوەیەکی جیا لە لە (فارابی) بەکاربرد. واتە ئەو هات لە میانی دۆزینەوەی حەقیقەتەکانی خۆیو لێکدانەوەکانی خۆی لە نێوان (ئەفلاتونو ئەرستۆ)دا چارەسەری ناکۆکییەکان بکات. بەڵام هەرگیز ناشێ ئەوە شاردنەوەی (ئەرستۆ) بێ لە عەرەب. ئەوەی بە کورتی (دەمانەوێ قسەی لێبکەین) ئەوەیە کە نابێ بە تەرازووی فەلسەفەی یۆنانی سەیری فەلسەفەی عەرەبی ئیسلامی بکەین. چونکە دەکەوینە دەرەوەی مێژوو.

(3)

جابری دەڵێت: هەرگیز گفتۆکردنی نێوان (رابردوو ئێستا)، (ئێستاو داهاتوو) لە فیکری مرۆییدا، دابڕانی بەسەردا نایەت. خودی ئەو مەسەلەیەش بە تەئکید بۆ کەلەپوور دەمانگەڕێنێتەوە. کە لە پێشەوە لەسەر ئاستی میتۆدو روونیا لێی دواین. هەوڵدەدەین ئێستاش لە سەر ئاستی پرۆسیسەکردن بیری لێبکەینەوە. هەردوو ئاستیش بەیەکەوە بەندن. چونکە ئەوەی ئێمە بۆ تێگەیشتنی خۆمان بونیادی دەنێین. بە شێوەیەکی راستەوخۆ جۆری تەوزیفکردنیش دیاریدەکات. بەڵام ئەوەی لە کەلەپوور دەمانەوێ. لە ئێستا تەوزیفی بکەین. هەموو کەلەپوور نییە بەڵکو ئەوەیە کە لێی ماوەتەوە لێرەدا پێویستە کەلەپوور لە دوو ئاستدا بخەینە بەرچاو،

**ئاستی یەکەم، ئاستی تێگەیشتنی کەلەپوور.**

**ئاستی دووەم: تەوزیفکردنو وەبەرهێنانەوەیە.**

واتە لە یەکەمدا پێویستە کەلەپوور بەهەموو جیاوازی قۆناغەکان وەربگرینو لە دووەمدا زێترو زێتر بەرەو ترۆپکی بکەینەوە، ئەو ترۆپکەی کە پێشکەوتن پێی گەیشتووە. ئەوەی ئێمە مامەڵەیان لەگەڵدا دەکەین. ئەوە نییە کە بابو باپیرانمان تیایدا ژیاون. یان ئەوەی کە کتێبەکان پاراستوویانە. بەڵکو ئەوەیە کە لێی ماوەتەوە. ئەوەی کە دەشێ ئێستاکە لەگەڵی بژین و قابیلی و پەرەسەندنە، قابیلی دەوڵەمەندکردنە. تاکو لە داهاتوودا بتوانی لەگەڵماندا بژیت. کەواتە چی لە کەلەپوورکان ماوەتەوە؟ رەنگە بەشێک لەو پرسیارە لە دووتوێی ئەو نوسینە وەڵامەکانی خۆی هەڵگرتبێتەوە. دوای ئەوەی باسمان لە ناوەڕۆکی مەعریفیو ئایدیۆلۆژی کرد. بۆیە دەبێ ئەوە بزانین کە ناوەڕۆکی مەعریفی لە فەلسەفەی ئیسلام و فەلسەفە کۆنەکانی دیکەی هاوچەرخی ئەو. مەعریفەیەکی مردووەو قابیلی ژیانی نوێ نییە. بەڵام خودی ئەو مەسەلەیە بە نیسبەت ناوەڕۆکە ئایدیۆلۆژیا جیاوازە.

ناوەڕۆکی مەعریفی هەر فەلسەفەیەک یەکجار دەژی، ناکرێ دووبارە ژیانی پێببەخشینەوە. کاتی مردیش یەکجار دەمرێ و هەرگیز دوای مردنی ناشێ بەجۆرێکی دیکە ژیانی هەبێ. چونکە ناوەڕۆکی مەعریفی زانستە _زانستیش مێژووی خۆی هەیە. مێژووی

زانست وەک "باشلار" دەڵێ:مێژووی هەڵەی زانستییە. بۆیە ناوەڕۆکی مەعریفی هەر فەلسەفەیەک یەکجارو دواجار دەمرێ. چونکە کاتێ دەچێتە ناو مێژوو. وەک ئەوە وایە کە دەچێتە نێو هەڵەوە. بۆیە دەمرێ و هەرگیز ناشێ بەدوایدا بگەڕێین. چونکە "هەڵە_ مێژووی نییە". لێرەدا دەتوانین بڵێین ناوەڕۆکی مەعریفی فەلسەفەی ئیسلامی و فەلسەفەکانی سەدەی ناوەڕاست و هەموو ئەو فەلسەفانەی لەسەر سروشتی فەلسەفەکەی ئەرستۆ هاتۆتە ئاراوە. بەهۆی چوونە نێو مێژووەوەو بەر لە هاتنی زانستی نوێ مردنی خۆیان راگەیاندووە "دیکارت فەلسەفەی خۆی لەسەر فیزیای گالیلۆ دامەزراند. بەڵام لەگەڵ هاتنی فیزیای نیوتن، کە کانت فەلسەفەکەی خۆی لەسەر دامەزراند. لەناو چوو.

بەڵام بە نیسبەت ناوەڕۆکی ئایدیۆلۆژی جیاوازە. چونکە ناوەڕۆکی ئایدیۆلۆژیا ئایدیۆلۆژیایە زەمەنی دەکەوێتە داهاتوو، واتە ئێستای ئەو لە داهاتوودا دەژی. بەڵام بەشێوەی خەون. وەک دەزانین خەونیش بەسروشتی خۆی دان بە چوار چێوەی شوێنکاتدا نانی _ئەویش تەواو بە پێچەوانەی زانست دەکەوێتەوە. چونکە زەمەنی زانست لە ئێستا دایە. زانست لە ئێستادا دەژی. گەر ئێستا خۆی جێبهێڵێ خۆی ڕەشدەکاتەوە. بۆیە ئێمە لێرەدا دەتوانین مامەڵە لەگەڵ هەندێ لە بۆچوونە ئایدیۆلۆژیەکانی ئەو فەلسەفەیەدا بکەین کە بەر لە ئێمە ژیاون. بەڵام ناتوانین مامەڵە لەگەڵ مادە مەعریفییەکەیان بکەین.

لێرەدا بەپێی پرەنسیپی ئێستا دەبێ ناوەڕۆکی خودی ئایدیۆلۆژیاش شیبکەینەوە تاکو بزانین کام بەشی مردووەو کام بەشی دەتوانی بژی " ژیانێکی دیکە" لە پێشەوە گوتمان زەمەنی ئایدیۆلۆژیا داهاتووە. ئەو داهاتووەشمان خستە دووتوێی دوالیزمێکەوە. ئێستا پێویستە ئەو دابڵۆقەیە هەڵگرین. چونکە داهاتووی ئایدیۆلۆژیا یەک نییە. ئایدیۆلۆژیا هەیە لە داهاتووێکدا دەژی کە خەونەکانی لە رابردوو وەرگرتووە. بەڵام ئایدیۆلۆژیاش هەیە کە داهاتووەکەی لەو ئایندەدایە کە دێ. هەر ئەو ئایدیۆلۆژیایە کە دەتوانی ژیانێکی دیکە بژی. چونکە مەیلی ئەو ژیانە دەکات. بەڵام ئایا چۆن ئەو دوو پۆلە لێکجیادەکەینەوە؟ بۆ وەڵامی ئەو پرسیارە دووبارە دەبێ بە رونیایەکی مێژووییەوەو بە ئاگاییەکی مێژووییەوە خۆمان پڕچەک بکەین. بێگومان کەلەپووریش بەشێکە لە مێژوو. شتومەکێک نییە لەدەرەوە وەرمانگرتبێ. بەڵکو بەشێکە لە ڕەوتی مێژوو. ئێمە لە پێشەوە گوتمان ناوەڕۆکی ئایدیۆلۆژی خاوەن مێژووی خۆیەتیو دەلالەت لە گەشەسەندنی کۆمەڵگا دەکات. کۆمەڵێک

ساتەوەختی بەدوایەکدا هاتووەو یەکێک ئەویدیکە رەشدەکاتەوە، یان یەکێک یەکێکی دیکە تەواو دەکات، کەواتە ئەو ئایدیۆلۆژیایەی کە لە (ئاهاتوو)ی رابردوودا دەژی، چرکە ساتەکانی ژیانی ئەو. ئەو چرکە ساتانەن کە بەرەو پێشچوونو پەرەسەندن رەتیاندەکاتەوە، بەڵام ئەو ئایدیۆلۆژیایەی کە ئاهاتووی خۆی ئاراستەی ئەو ئایندەیە دەکات کە بەرەو رووماں دێت، ئەوا ساتەوەختی ژیانی ئەو ئایدیۆلۆژیایە. ساتەوەختێکە کە پەرەسەندن و بەرەوپێشچوونی مێژوو ناتوانی رەتیبکاتەوە.

ئەگەر لە دووتوێی ئەو مانایەی سەرەوە سەیری کەلەپووری عەرەبی بکەین، دەتوانین لەدەرەوەی ناوەڕۆکی مەعریفیانەوە، سەیری ناوەرۆکە ئایدیۆلۆژیەکەی بکەین. هەروەها لەم بارەشەوە دوو ساتەوەختمان راگەیاند، جا ئەگەر ساتەوەختی یەکەم، ساتەوەختی خەونی (فارابی) بێ، کە (ئیبن سینا) تیایدا ژیا، ئەوا ساتەوەختی دووەم ساتەوەختی خەونی (فارابی)یە کە دواتر (ئیبن روشد) گەشەی پێدا. بەمجۆرەش ئەوەی لە کەلەپوورمان دەمێنێتەوە، ناکەوێتە سەر ساتەوەختی یەکەم، چونکە وەک گوتمان ساتەوەختی دووەم بە شێوەیەکی مێژوویی رەتیکردۆتەوە، واتە هەموو ئەوانەی دوای (ئیبن روشد) لەدەرەوەی مێژوودا بەسەر دەبەین. بەراستی ئێمەی عەرەبیش ژیانی خۆمان دوای (ئیبن روشد) لەدەرەوەی مێژوودا بەسەر دەبەین، چونکە خوومان بە ساتەوەختی (ئیبن سینا) گرتووە، دوای ئەوەی "غەزالی" هێنایە ناو ئیسلام.

## پەراوێزەکان

* دەشێ ئەم نوسینە خوێندنەوەو بەرجەستەکردنی دەروازەی کتێبی "نحن والتراث"ی محەمەد عابد ئەلجابری بێ، کە لە بەیروت/ ١٩٨٠_ چاپکراوە.

١- تۆرنتالیست: لە زمانی کوردیدا (خۆرهەڵاتناس) بەکارهێنراوە.

٢-فیزلۆژی: واتە وەرگرتنی زاراوەیەک و تێگەیشتن لە ماناکانی و پاشان بەکارهێنانی ئەو زاراوەیە بۆ لێکۆڵینەوەی دیاردە سیاسی و کۆمەڵایەتی و فیکرییەکان.

٣- ئێمە بۆ "القياس الغائب على الشاهد"مان بە پەسەند زانیووە.

٤- بڕوانە: التراث والحداثة_ دراسات والمناقشات/ مركز دراسات الوحدة العربية، چاپی یەکەم، ١٩٩١.

٥- فیزلۆژی: فقه اللغة.

٦- بڕوانە: التراث والحداثة_ دراسات والمناقشات/ مركز دراسات الوحدة العربية، چاپی یەکەم، تەمموزی ١٩٩١.

٧- هـ.ص.پ.

٨- غنوسیەت: مەزهەبێکی ئایینییە.

* بیرکردنەوەو خوێندنەوەی (جابری) ڕەنگە نەشێ ڕاستەوخۆ وەک بونیاتێک بۆ دیراسەکردن و بەدواداچوون و لێکدانەوەو پێکەوە لکانی دیاردەکان و هەندێ لە چەمک و پرینسیپەکان، سەیربکرێت، بەو مانایەی کە هەموو زەمانێک چەمکی تایبەت بە خۆی لە دووتوێی شارەزایی و ئاگاییە خودییەکانەوە بەرهەمدێنن، هەر لە هەناوی هەمان ئاگاییشەوە وێنە بە بینراوو ئەودیوو نەبینراوەکانیشەوە دەبەخشن، کەواتە لە دەرەوەی هۆشیاریو ئاگاییە خودییەکانی هەر زەمانێک، پرۆسەی (ناونان) بەبێ بەهاو ناوبراوەکان لاوازو شەرمنانە دەکەونەوە، واتە هەم ئاستی بینراوەکان دادەبەزێنن، هەم ئاستی زمانیش لەکەدار دەکەن بەڵام لەلایەکی دیکەوە دەشێ خودی (جابری) وەک کەلەپورێکی زیندووی بەجێماو، بەشێک لە بەدیهێنانی مومکینەکانی ئێستار دڵماتووی لەخۆدا هەڵگرتبێ، بەومانایەی کە بتوانین لە بری پاساو هێنانەوە بۆ زمانو واقیعی چەسپاو، لە دووتوێی خوێندنەوەی (جابری)و لەبەر ڕۆشنایی هەلومەرجو پێداویستییەکانی سەردەم، لەناوەوەی خۆماندا "چەکی ڕەخنەو ڕەخنەی چەک" بۆ تێگەیشتن لە ئیشکالیەتەکان بەرز بکەینەوە، هەر لە دووتوێی ئەو خوێندنەوە بەرهەمهێنەرانەشدا دەتوانین بیروڕا جیاوازەکانی کۆمەڵگا تا ئاستی لێکۆڵینەوە هەڵبخەینو لەوێشەوە ڕاستەوخۆ بە کردە عەقڵانییەکەوە پەیوەستی بکەین، واتە سیستەمێک بنوێنین کە بڕوای بە جیاوازییەکانو گۆڕانکارییەکانی سەردەمەوە هەبێت.

کەواتە دەشێ لە دووتوێی (جابری) وەک بابەتێک بۆ خوێندنەوە، وەک کەلەپورێکی زیندووی بەجێماو، دواجار سروشتی ئاماژەکان بە شێوەیەکی دیکە بۆ بیرلێکردنەوەو بەدواداچوون بخەینەڕوو کە بتوانین خودی خۆمانی تیا بدۆزینەوە، یان وەک خوێنەرێکی هۆشیارو شارەزا دووبارە لە ئاستێکی دیکەی بیرکردنەوەدا بەرهەمی بهێنینەوە، بەو مانایەی کە خودی خوێندنەوەی خوێنراوەکان لە بەرهەمهێنانەوەدا دەلالەت لە گولسنەوەی ئەو سیستەمە عەقلانییە بکات، کە زیندوێتی (جابری) لەخودا هەڵگرتووە .

کەواتە لەسەر ئەو پرنسیپە دەتوانین بڵێین هەر خوێنراوەیەک وەک بابەتێکی زیندوو کەوتە ژێر خوێندنەوە، راستەوخۆ دەبێتە کەلتورو دەشێ بەهۆی ئاگاییە خودییەکانەوە خۆمانی تیا بدۆزینەوە، بەڵام لێرەدا ئامانەوێ وەک بنەمای خوێندراوەکان نەخشە بۆ بیرکردنەوەی (جابری) بکێشین. چونکە ئێمە لەم ئاستەدا وەک بنەما دەستیان بۆ درێژ ناکەین، بەڵکو خودی ئەم نەخشەیە راستەوخۆ بە خوێندنەوەی بەرهەمهێنەرانەوە پەیوەست دەکەینو هەر لەوێشەوە هەوڵدەدەین دووبارە وەک منێکی وجودی خۆمان پراکتیزە بکەینەوە، خودی ئەو خۆ پراکتیزەکردنەش هەرگیز دەلالەت لە "دووبارەکردنەوە" ناکات، بەڵکە دەشێ دەلالەت لە بزاڤی ئاگاییانەی خودو ئازادییەکانی خود بکات، لەلایەکی دیکەش تەعبیر لە بەشێک لە بزاڤو ئازادیو لە گۆڕانکارییەکانی سەردەم، پێشکەوتنەکانی سەردەم دەکات.

# مەسەلەی شوناس و
# بیرکردنەوەی (جابری) وەک ناسیونالیستێک

پرسیاری شوناس هەرتەنها پرسیارێکی رووتی بێ ڕەهەند نییە، بەڵکو پرسیارێکە بە پێی شوێنگەو ساتەوەختی جیاجیاو دیاریکراوەوە، ئاست و چۆنێتی و تایبەتمەندێتیی خۆی هەیە، لە لایەکی دیکەشەوە، دەلالەتو مانای جۆراوجۆرو چەمکی جیاواز بە پێی ئاگاییو بەرەوپێشچوونی کۆمەڵگا لەخۆ دەگرێت. ئەگەر تا دوێنێ خودی ئەو پێناسەیە ڕاستەوخۆ بە وجودو ماهیەتی (من) بەند بێ، دیارە ئەمڕۆ (ئەویدی)ش دەخاتە نێو هەمان چەمکەوە، واتە ئەو کەوانەی کە(من) لەخۆ دەگرێ وەک پێویستیش ئەویدی دەکاتە تای تەرازووی خۆی و خۆی لەسەر پێناسە دەکاتەوە .

بێگومان وەک ئاگادارین بیریارانی عەرەب، بە چەندان شێوەو ڕێچکەی جیاجیا لەم مەسەلەیەیان کۆڵیوەتەوەو (جابری)یش هەمیشە بۆ بەدواداچوونی ئەو مەسەلەیە تەئکید لەسەر هەلومەرجەکانی مێژووی عەرەبی و کەلەپورو زمانی عەرەبی دەکات. یان بە مانایەکی دیکە ڕاستەوخۆ پرسیارە سەرەکییەکانی عەرەبی لە دووبارە گەڕاندنەوەی خودو زیندووکردنەوەی بابەت دەنوێنن. لە لایەکی دیکەشەوە، هەوڵدەدەن بیر لە چۆنێتیی مامەڵەکردنی کەلەپوورو چۆنێتیی دەستبردن بۆ ئێستاو پراکتیزەکردنی شۆڕش و بونیادنانەوەی کەلەپوور بە ئەرکی هەنوکەیی ڕۆشنبیران و بیریارانی عەرەبی لەقەڵەم دەدەن. بەڵام (جابری) سەلەفییەتی بیرکردنەوەی ئەو سێ تەوەرەیە لەوەدا دەبینێتەوە کە لە نەبونی رونیاو بابەتەوە، دوای وەڵامەکان دەکەون، چونکە لای ((جابری)) نەبوونی رونیاو بابەت خودی فیکرو مێژووی فیکر دووچاری فەرامۆشی دەکات، هەر فیکرێکیش بەو مانایە بکەوێتە ژێر فەرامۆشییەوە بێگومان وەک گوتمان سەربەخۆییو ئازادی خۆی لەدەستدەدات و لەم نێوانەدا بۆخۆی وندەبێ و ناتوانێ پارێزگاری لە خۆی بکات، ئەگەر بەو مانایەش نەیتوانی پارێزگاری لەخۆی بکات، کەواتە ناشتوانێ ئامادەیی خۆی بنوێنێ بۆیە هەمیشە وەک بابەت نابەشدەکرێ، واتە، چونکە ناتوانێ وەک خود دابگیرسێ. ئیتر هەوڵدەدات لەمیانی ئەو دابەشکردنەدا وەک توخمێک کە ساتەوەختی خۆیو شوێنی خۆی جێهێشتووە بێتە مەیدانەوە، توخمێک کە ناشێ ئازادییەکان دەستەبەر بکات، توخمێک کە بە تەئکید ناتوانێ خەونو بیرکردنەوەی (بونیادی ونبوونی خۆی) هەڵگرێ بەمجۆرە لەبری خەملاندنی دەلالەت هەر تەنیا دەتوانی وێنەی خۆی لە شێوەی دال بکێشێ بە پیرۆزکردنو دەست بۆنەبردنی دالیش، یان ئامادەیی رەمزیانە لە سەرووی واقیعو پانتاییەکانی دەلالەتەوە هەمیشە کردەو ئاگایی عەقلی، دووچاری حاڵەتی شیزوفرینیا دەکات هەر لە توێی ئەو لەتبوونەشەوە ئامۆیی وەک دنیا، دنیایەکی لێکترازاوی ((من)) خۆی دادەمەزرێنێ.

لێرەدا ((جابری)) سەلەفییەتی ئەو سێ تەوەرەیە لەوەدا دەبینێتەوە، کە هەم هەرەمەکیانە بیر لە وەرگرتن دەکەنەوە، هەم بە شێوەیەکی نائاگاییانەو لاشعوریانە پابەندی بەها کۆن و تەقلیدییەکان دەبن و دەڵێن لەوێشەوە خۆمان لە ساتە وەختی ئێستادا وندەکەین و هەرگیز ناتوانین وەک خۆمان بیر لە داهێنان بکەینەوە. هەروەها وەک دەزانین خودی ئەو پرۆژەیە ((جابری)) لە کتێبی ((نحن والتراث))دا هێڵە سەرەکییەکانی دەخاتە بەردەستی خوێنەران و

لەهەرسێ بەشی ((النقد العول العربی))دا، لایەنە قوڵەکانی ئاشکرا دەکات و وەک خاوەن بیرێکی لێهاتوو، مەسەلەکان بە شێوەیەکی ڕێکوپێک پۆلێن دەکات و لە میانی پۆلێنکردن و پێوانە دیاریکراوەکاندا دیالۆگ لەگەڵ بیریارانی عەرەبی و هەرسێ تەوەرەی ناوبراو دادەمەزرێنێ.

ئەوەی دەمانەوێ قسەی لەسەر بکەین کتێبی (مسالة الهویة)یە، کە لەساڵی (١٩٩٥) دا چاپی یەکەمی خستووەتە بازاڕو چاپی دووەمیشی لە ساڵی (١٩٩٧)دا بڵاوکردۆتەوە، لێرەدا ئەوەی پەیوەندی بە ناوەرۆکی ئەو کتێبەوە هەیە لەسێ بەشی سەرەکیدا خۆی دەنوێنێ: بەشی یەکەمی باسی عرووبەو ئیسلام و یەکێتیی ناسیونالیزمی عەرەبییە. بەشی دووەم باس لە منو ئەو دەکات، بەڵام بەشی سێیەم وێنەی عەرەب و ئیسلام لە میدیاکانی خۆرئاوا دەخاتە بەر خوێندنەوە.

مەسەلەی شوناس پرسیارێکە لای (جابری) کە بە پێی باروودۆخ و شوێن و ساتەوەختی پرسیارکردن و بەرژەوەندییە جۆراوجۆرەکان و ئاگایی و ڕۆشنبیریی و ڕوئیای جیاوازەوە گۆڕانی بەسەردا دێت و ماناو دەلالەت و وێنەی جۆراوجۆر لەخۆ دەگرێت. کەواتە پرسیاری شوناس هەمیشە پرسیارێکە لەبەرامبەر ئەویدی لە ئێستاو ساتەوەختی ئێستادا سنورەکانی دادەڕێژێ، لەلایەکی دیکەش خودی ئەو پرسیارە ڕاستەوخۆ دەلالەتی شوێن (بەنیسبەت عەرەب- ئەوت) و پەرگیری نابینی، یان ڕەگەزپەرستی و تاراوگەیی و دەوری سەرەکی لە وەڵامەکاندا دەبینێ.

کاتێ لە نێو عەرەب و شوێنگەی عەرەبی، یان شوێنگەی ئیسلامی، پرسیاری عەرەب لە زەمەنێکی دیاریکراو دەکەین، ڕاستەوخۆ دەڵێین: عەرەب ئەو نەتەوە داگیرکراوەو پارچەپارچەکراوە موسوڵمانەیە کە ئەویدی بۆ بەرژەوەندییەکانی خۆی دابەشی چەندین قەبارەی جیاجیای دەستکردی کردووەو لە نێوەڕاستیشیدا قەبارەی زایۆنی چەسپاندووە.

بەڵام ئەگەر پرسیاری شوناس لەلایەکی دیکە پرسیار بێ لە ماهییەتو وجود، لەبەرئەوەی هەمیشە وجودیش پێش ماهییەت دەکەوێ بۆیە لەم حاڵەتەدا بیر لە ئامادەیی ئەو وجودە دەکەین. ئامادەیی وجودیش هەرگیز ناشێ پێناسەی خۆی لە دووتوێی بڕیارێکی سیاسیانە قەتیس بکات، بە دیوەکەی دیکەش ئەگەر پێناسەی ئەورووپی بە ئیبداعە زانستیو

تەکنەلۆژییەکانو بەرژەوەندییەکانەوە پەیوەست بکەین. ئەوا پێناسەی عەرەبی لەم رووەوە ناتوانی یان هێزی دەرکەوتنی ئەوەندە لاوازە کە رووی خۆ نمایانکردندا نییە.
بەلام وەک دەزانین جیاوازییە گەورەکانی پرۆژەی یەکێتی عەرەبی و یەکێتی ئەورووپی لەوەدایە کە یەکێتی عەرەبی پێناسەی وجودی خۆی لە میانی یەکێتی زمانو رۆشنبیرییەوە دەخاتەڕوو، بەلام ئەورووپا لەسەر بەرژەوەندییە ئابوورییەکان درێژە بە وجودی خۆیدەدات. وەک دەشزانین بەردی بناغەی ناسیونالیزم بە پێناسەی رۆشنبیرییەوە دەلکێ. بەلام یەکێتی ئەورووپی هەمیشە بڕیارێک بووە کە ویستی سیاسیی هێلە پانەکەی دەکێشێ و بڕیارێکە لە ویستی سیاسییەوە هەلدەقولێ. لێرەدا ئەگەر تەگەرەکانی یەکێتی عەرەبی لە دووتوێی ئەو رستانەی (جابری) ویستی سیاسی دەوری تیا ببینێ. دەبێ بۆ تەگەرەکانی یەکێتی ئەورووپی بۆ یەکێتی زمان و رۆشنبیریی بگەڕێینەوە. دیارە (جابری) هەموو بازنانە فەلسەفی و زانستی و تەکنەلۆژیاکان دەخاتە دەرەوەی زمانو رۆشنبیریی وەک ئەوەی هەرگیز ئەو تواناو هێزە سەرسوڕهێنەرانە بە نێو زمان و رۆشنبیریدا گوزەریان نەکردبێ. یان هەرگیز بیری لەوە نەکردۆتەوە کە زمانی هەر گەل و میللەتێ بیرکردنەوەی ئەوانە لە نێو زماندا. یان بەو زمانەوە دەتوانین دنیای خۆیانو واقیعی کۆمەلایەتی دابمەزرێنن. نازانێ بیرکردنەوەی هەر میللەتێ بەپلەی یەکەم بیرکردنەوەیە لە نێو زماندا. زمان روونیای ئەوانە بۆ دنیاو رێگەی بیرکردنەوەی ئەوان لەخۆ دەگرێ. واتە زمان نهێنییەکانی ئیبداع و ئاگاییەکانی خودی مرۆڤایەتی لەخۆدا هەلگرتووە. (جابری) هەمیشە بیر لەوە دەکاتەوە یان ئەوە دەردەخات کە عەقل ئامرازی زمانە بەلام هەرگیز بیر لەوە ناکاتەوە کە زمان بۆخۆی ئامرازی عەقلەو لە دووتوێی زماندا دەشێ دەست بۆ مەرجەکانی ئازادیو ئیبداعو ئاگایی عەقلی مرۆڤ بەرین. کاتێ دەلێین مرۆڤ بونەوەرێکی کاراکتەرو ئازادە لە بیرکردنەوە، واتە بونەوەرێکە خەلقی زمان دەکات هەر لەڕێگەی بەرەوپێشچوونی زمانەوە عەقلیش بەرەو پێشدەچێت وەک چۆن لە رێگەی بەرەوپێشچوونی عەقلیشەوە زمان دەبوژێتەوەو زیندوو دەبێتەوە. بۆیە هەرگیز ناتوانین زمان وەک چوارچێوەیەک بۆ بیرکردنەوەو قەتیسکردنی بیرکردنەوە بخەینە کار. بەلکو هەمیشە دەبێ بروامان بەوە هەبێ کە زمان ئەو کایە کراوەیە. یان ئەو پەنجەرە کراوەیە بەرووی ژیارییەکاندا کراوەتەوە. لێرەدا دەبێ بزانین کە راستە زمان نەتەوەکان دیاریدەکات بەلام

هەرگیز بۆ ئیبداعاتی فەردی چوارچێوە دانارێژی. راستە رۆنیایە بۆ دنیا بەلام هەرگیز نابێتە شای بیرکردنەوە هەروەک چۆن بیرکردنەوەش شای میللەتان نییە بەڵکو راستەوخۆ بەتاکەوە بەندەو بەتواناو هێزی تاکەوە دەلکی لە کۆتایی تاکەکاندا بە میللەتەوە بەند دەبێ.

ئەگەر لێرەدا پێناسە تەئکید لە (من)و هێزی (من)و بەرخودانو پەرچەکرداری (من) بکات. رووبەرووی ئەویدی. ئەوا پێناسەی منی عەرەبی پێناسەیەکە هەر تەنیا دەلالەت لە ماهیەتێکی جێگیرو ناماددو وجودێکی بنبەستوو ناکات (بە پێی بۆچوونی جابری). بەدیوەکەی دیکەشدا ئەگەر پرسیاری ئەویدی بۆ عەرەبی دوالیزمی (عەرەبی/ئیسلامی) لەخۆ بگرێت پرسیاری (جابری) ئەوەیە ئایا پێناسەی ولآتانی عەرەبی و ئیسلامی وەک شوێن دەکەوێتە سەر عەرەب یان ئیسلام؟ ئەگەر بە شێوەیەکی دی ئیسلام ماددەی عەرەب بێ – یان عەرەب ماددەی ئیسلام بێ- بەوپێیەی کە قورئان بە زمانی عەرەبییەو خودی پێغەمبەر عەرەبە.

بەلآم کە دەلێین عەرەب ماددەی ئیسلامە واتە عەرەب لە پێناو ئیسلام و بڵاوکردنەوەی ئایینی ئیسلام قوربانی جۆراوجۆری داوە. مێژووی ئیسلامی پێکهێناوە. بەلآم کە دەلێین ئیسلام عەرەبییە. ئەوەش عەرەبی ئیسلامی لە خۆدەگرێت. نەک هەر بە مێژوو- ژیاری، بەڵکو بە ئایینیش.

کاتێ بەمجۆرەش بیردەکەینەوە عەرەب بۆ کەلەپور دەگەرێتەوە. واتە عەرەب چەمکێکە بەلای رابردوودا دەکەوێتەوە. نەک ئێستای ئیسلامی. چەمکی موسوڵمانیش بەشێوەیەک لە شێوەکانی شوێنی عەرەبی گرتۆتەوەو وەک حەقیقەتێکی چەسپاوو ناماده خۆی نواندووە

بەو مانایەش ئەوەی کە بەدحالێبوون دروستی دەکات راستەوخۆ رێکنەکەوتنە لەسەر چەمکێکی دیاریکراو. چونکە خودی دوانەیی (عەرەبی/ئیسلامی) بەکۆمەڵێ بیروبۆچوونی جیاجیا قسەی لێدەکرێ. هەندێ بۆ کەلەپوورو زمان و ئایدۆلۆژیا دەیگێرنەوە. هەندێکی دیکە بەپێی فیکری ئەورووپی قسەی لێدەکەن. بەشی سێیەمیش تێکەڵەیەکن لە هەردووکیان.

ئەگەر لە مەرجەعییەتی کەلەپوورەوە بۆ عەرەب بروانین دەبینین عەرەب شتێکەو ئیسلام شتێکی دیکە. بەلآم بە چاوی ئەورووپا ئەو دووشتە تێکەڵ بەیەکدەکرێ. ئەوا سەرەرای ئیشکالییەتەکانو بەدحاڵیبوون. بێ مانایە دانیشتوانی ناوچە عەرەبییەکان مامەڵەی دوانەیی (ئیسلام/عەرەب)یان لەگەڵدا بکرێت. چونکە بە گشتی خۆیان عەرەبنو خاوەن

چارەنووس و بەرژەوەندی هاوبەشن. هەروەک بێ ماناشە ئەگەر دانیشتوانی ئێران و پاکستان لەبەرامبەر موسوڵمان و ئێرانی، یان پاکستانی و موسوڵمان رابگرین.

کەواتە ئەگەر پرسیاری عەرەب کێیە راستەوخۆ خودی عەرەب لەخۆ بگرێ ئەوا پرسیاری یەکێتی عەرەبی پرسیارێکە پێویستی بە نوێکردنەوە هەیە. نوێکردنەوەی ئەو پرسیارەش ئەگەر لە وێنەی فەلەستینی و ئازارکردنی فەلەستین پەنجەی بۆ درێژ بکەین. خودی بێ مانای ئەو پرسیارە دەشێ هەرەسهێنانی (١٩٦٧) هێڵەکانی دیاریبکات بەو مانایە هەرەس سەلماندی کە هیچ دەوڵەتێکی عەرەبی تێر (خود) نەبووە. یان بە مانایەکی دیکە هەست بە خودێکی پتەوو بەرز ناکات. بۆیە ناتوانن خۆیان بخەنە رووبەڕووبوونەوەی ئەویدییەوە. لێرەدا پێویستە دەوڵەتانی عەرەبی لە (خود) تێربن. تێربوون لە خود واتە زەرورەتی تەنکیدکردن لە خودو چوونە نێو مێژوو. کاتێ عەرەب لە بەرامبەر ئەویدی هەست بەکەمێتی خۆی دەکات. لەهەمانکاتدا هەست بەوەش دەکات کە توانای چوونە نێو مێژووی نییە. بەڵام سەرەڕای هەموو ئەوشتانەش ئایدۆلۆژیای عەرەبی لە دەرەوەی هەلومەرجەکانەوە لەدەرەوەی مێژوو لەدەرەوەی واقیعی عەرەبیو خودی کاراکتەرو داهێنەری عەرەبییەوە دەست بۆ دیمکراسیەت درێژ دەکات. وەک ئەوەی لەوانە کەوتبێتەوە. (جابری) دەڵێ نامۆیی دیمکراسیەت لە وڵاتانی عەرەبیدا لەوە دەبینم کە مەرجی دیمکراسیەت وەک ئەوەی (ئەسینا)و (رۆما) لە ئارادا نییە. سیستەمی دیمکراسیەت لە خۆرئاوای نوێ راستەوخۆ لە درێژبوونەوەی سیستەمی دەرەبەگایەتییەوە هەڵقوڵاوە بەو شێوەیەی کە ئەوان ئاسیویانە بەڵام خودی ئەو هەلومەرجە لە وڵاتانی عەرەبی جۆرێکی تر لەخۆ دەگرێ بۆیە هەمیشە بۆ ئاسینی بەروبوومەکانی دیمکراسیەت دەبێ بۆ خۆرئاوا بگەڕێینەوە .

لێرەدا کاتێ دەڵێین ئەو واقیعە دیمکراسیەت ناناسێ و پرۆسیسەی دیموکراسیەتی نەکردووە. واتە واقیعێکە لە ژێر زەبری داپڵۆسینەرانەی بێگاریدا ژیان دەباتە سەر. بەو مانایەش فیکرەی ناسیۆنالیزمی عەرەبی لە ژێر نەبوونی دیمکراسیەتدا دەناڵێنێ.

لەلایەکی دیکە ئەو فیکرە هەرێمایەتییەی کە وڵاتانی عەرەبی پێی دەنازن بە هیچ شێوەیەک ناتوانێ لە پێناو یەکێتی عەرەبی واز لە خۆی بهێنێ چونکە هەمیشە خۆی بە سێنترال دەزانێ و ئەویدیش بە کەنار. یاخود بە مانایەکی دیکە پێیوایە لە خود پڕبووە.

یان فیکرەیەکە تەواو لە فیکرەی فریادڕەس خۆی نزیکدەکاتەوە. کە دەبێ ئەوانیتر لە نێویدا بتوێنەوە.

کەواتە فیکرەی یەکێتی عەرەبی قۆناغێکە پاڵ بە خەونەوە دەدا نەک ڕاستی. ڕەنگە ئەو خەونەش هەمیشە خەونی دواڕۆژی ڕابردوو بێ. بەڵام ئێستای عەرەبی هەرگیز ئەو بانگەشەیە هەڵناگرێ. چونکە ئایدۆلۆژییەتی یۆتۆپیی لەو بانگەشەیەدا خۆی دەنوێنێ ئەگەرچی یەکێتی عەرەبی دەشێ لە ئاستی کەلتوورو زمانی هاوبەشو کەلەپوورو هەمە هاوبەشەکانی دیکەدا دەرفەتی بۆ بەدواداچوون قوڵبونەوەی ئەو مەسەلەیە بدۆزێتەوە. چونکە وەک وتمان ناسیۆنالیزمی عەرەبی ڕاستەوخۆ بەو هەمەوە بەندە. بەڵام لەسەر ئاستی ئابووریدا حەزەکە بە ئاستێکی دیکەدا دەڕواو شێوەی دیکەی جۆراوجۆر دەنوێنێ: هەروەها بە پێی دووروونزیکیان لەویدی کۆمەڵێک شێوەی جیاجیا دەنوێنن. بەکورتی بەشی یەکەمی ئەو کتێبە ڕاستەوخۆ ئیشکالییەتی (عەرەبی/ئیسلامی)و دەوڵەتە عەرەبییەکان و مەسەلەی فەلەستین و یەکێتی عەرەبی و پێوەندییەکانیان دەخاتە بەرباس و لێکۆڵینەوە. بەڵام لە بەشی دووەمدا وەک وتمان باس لە ئێمەو ئەویدی دەکات و ڕۆڵی (ئەویدی) لەبەرەوپێشچوونی (ئێمە) دەخاتە بەرچاو وێنەی داهاتوو ئاسۆکانی بە شێوەیەکی گشتی و بە پێی (داهاتوو- ڕابردوو)ی ئەویدی (داهاتووی ڕابردوو) خۆیدەخاتە ڕوو. بەڵام نەک لە ڕێگەی جادوو بەخت گرتنەوە. بەڵکو هەمیشە مومکینەکان لە ڕێگەی بەڵگەدارەکانەوە دەگرێ و بۆئەوەش پشت بە وەسیلە زانستییەکانی سەردەم دەبەستێ. هەروەها بە شێوەیەکی گشتی پرۆژەی داهاتووی (من) ڕاستەوخۆ بە پرۆژەی داهاتووی (ئەویدی) دەبەستێتەوەو دەڵێ: هەر پرۆژەیەک کە مرۆڤ بۆ داهاتووی خۆی دایدەمەزرێنێ پێویستە بە شێوەیەکی ناگاییانە. یان ناگاییانە کردەو پەرچەکردەی ئەویدی، ئەویدی ئەمڕۆو ئەویدی سبەی لەبەر چاو بگرێ.

بەو مانایەش بیرکردنەوە لە داهاتوو بێ وجودی ئەویدی لە ئارادانییە. کەواتە ئێمە بۆیە بیر لە داهاتوو دەکەینەوە چونکە لە ئێستاماندا شتێ هەیە کە ڕقەبەرایەتیمان دەکات و هەڕەشەمان لێدەکات و پێشماندەکەوێ. کەواتە بیرکردنەوەی (داهاتوو لە ڕابردوو) خۆی هەردەبێ (ئەویدی) یەک وەک دیارکەرێ لە دیارکراوەکانی لەخۆ بگرێت. بڕیاری دووەمیش ئەوەیە کە بیرکردنەوە لەو داهاتووەی کە دێ بە شێوەیەک لە شێوەکان دەبێ (ڕابردووی

باهاتوو) ئامانجی خۆیتیا بنوێنێ، به جۆرێکی دیکه پێدراوه ئامانجیەکانی عەرەبی بەشێکی گەورەی لەگەڵ هەردوو ئەوینیکه یەک دەگرنەوە واتە ئیسرائیلو خۆرئاوا، بەو مانایەش باهاتووی ئیسرائیلو خۆرئاوا ئەو ئەوینیکەیە کە باهاتووی عەرەبی دووچاری سەختڵەتی دەکات نەک هەر هێندەش بەڵکو وا لە عەرەب دەکات کە بیر لە باهاتوو بکاتەوە.

لە لایەکی دیکەش بیرکردنەوە خەسڵەتێکە لە خەسڵەتەکانی ئەمڕۆ. نەک بەو مانایەی کە سەدەی کۆن ئەو بیرکردنەوەیەی لانەبووە. بەڵکو بەو مانایەی کە بیرکردنەوە بەر لە رێنیسانسی ئەوروپی بە نیسبەت باهاتوو چارەنووسی دوای مردن بووە. خەڵکی ئەو دنیایەیان بە جۆرێک چاو لێدەکرد. دنیاکەی دیکەشیان بە چاوێکی دیکەوە. یاخود بە پێی بیرکردنەوەی ئایینی جۆراوجۆرا جیاوازی دەنواند. بۆ نموونە لە دیدی فالگرەوەو ئەستێرەناسەکان جۆرێک بوو لە (کەش)، لەلایەکی دیکەش باهاتووی مرۆڤ لەدوای مردنو دووبارە گەڕانەوەی ئەو رۆحەی دەگەیاند. جۆری سێیەمیش بۆچوونی بیریارو فەیلەسوفەکان بەر لە مردن پەیوەست بەو زانینە بوو کە مرۆڤ دەربارەی دنیا هەیەتی. یان بەو مانایەی کە مەعریفەی مرۆڤ بەنیسبەت گەردوون وا لە مرۆڤ دەکات کە بە دڵنیایی بژیو بیربکاتەوە. واتە رێگاکانی بەختیاری لێرەدا لە مەعریفەوە خۆی دەبینێتەوە.

رەنگە دریژەدان بەو بیرکردنەوەیە . یان بیرکردنەوە لە باهاتوو راستەوخۆ پەیوەندی بە فەلسەفەوە بکات. ئایا بێکۆتایی ئەو مەسەلەیە (بێکۆتایی)بوون لە خۆ دەگرێ. ئایا گەردوون ئەزەلیو ئەبەدییە. هەر لە ئەزەلەوە هەیەو تا هەتایە دەمێنێ. یان بوون سەرەتاو کۆتایی هەیە. پرسیارێکی دیکەش ئەوەیە ئایا خاڵێک هەیە دیاریکراوی بۆ جڵەوگرتنە دەستی هەموو دنیا. ئایا فریادرەسێ هەیە ئەو جڵەوە بگرێتە دەست.

کاتێ کە مەسیح هات تەواوی ئەو یەقینە یەهودییەی خستە ژێر پرسیارەوە بەوەی کە بانگەشەی ئەو رووی لەهەموو مرۆڤێک بوو هەمووی وەک یەک حساب دەکرد بەڵام دواتر ئەو بانگەشەیە روویەکی دیکەی ئایدۆلۆژی ئایینی لەخۆگرت تا دەوڵەتێکی جیهانی لەخۆ بگرێت. بەمجۆرە ئەگەر پێشتر مرۆڤایەتی لە پێناو کەنیسەوە هاتبێتە دنیاوە. ئەوا دوای ئەوەی ئەوروپا وەک خوێنێکی بکەرو زاڵ و باهێنەر خۆی فەرزدەکرد. خودی ئەو وتەیە گۆڕاو مانایەکی دیکەی لە خۆگرت ئەویش ئەوەبوو کە مرۆڤایەتی لە پێناو ئەوروپاوە هاتۆتە دنیاوە. ئەوروپا تەواوی ئەوینیکەی داگیرکردو بەو مانایەش ویستی باهاتووی

رابرنووی خۆی پراکتیزە بکات کە ئەویش پراکتیزەکردنی رۆحی ئیمپراتۆرییەتی رۆمانی کۆن بوو بۆ ئەوەی لە رێگەی ((ئاهاتووی رابردوو)) دەست بەسەر تەواوی دنیادا بگرێتەوە.

دوای رینیسانسی ئەوروپی ئەو فیکرەیە بۆ فیکرەی دەوڵەتی ناسیۆنالیزمی گۆران خودی ئەو گۆڕانەش رێگای لەبەردەم جیاکردنەوەی کەنیسەو دەوڵەت خۆشکرد. لەلایەکی دیکەش فەلسەفەو مێژوو شوێنی ئایدیۆلۆژیەتی پاپەوییەتیان گرتەوە. خودی گوتاری فەلسەفی، گوتاری ئایینی بەتاڵکردو رونیای دنیا هاتە ئاراوە. رونیا ئایینییەکانی خستە دواوە.

بەر لە رینیسانس ئەوروپا وابیریدەکردەوە کە مرۆڤی کۆن زیتر پێشکەوتووترە لە مرۆڤی ئێستاو لە مرۆڤی ئێستا باشتربوون. بەڵام رینیسانس تەواوی ئەو بیرکردنەوانەی گۆڕی و کۆمەڵێک کەشفی زانستی و جوگرافی هێنایە ئاراوە. بەو مانایەش فەلسەفەی مێژوو دووبارە منی ئەوروپی هێنایەوە وجود. واتە فەلسەفەی مێژوو لە ئەوروپاو لەسەدەی (۱۸و۱۹) شوێنی شتە هەرە پیرۆزەکانی گرتەوە. بەڵام ئاخۆ پێکهاتەی منی ئەوروپی بێ ئەویدیکە چۆن درێژە بەخۆیدەدات. ئایا ئەویدی وەک دەستی دووەم نییە بۆ چەپڵەلێدان.

بەو مانایە ململانێی نێوان عەرەبو خۆرئاوا کێشەو ململانێیەکە کۆمەڵێک فاکتەر دەوری تیا دەبینێ. یەکێک لەوانەش یادەوەری رۆشنبیری و ئەویدیکەیان فاکتەری بەرژەوەندییە. بەو مانایە سیستەمی تاک رەهەندێ ئەوروپی دوای نەمانی ئەویدی دەبێ هەمیشە پرسیاری سەرەکی لە دۆزینەوەی ئەویدیکەوە هەڵگرێتەوە. بەڵام ئاخۆ ئەویدیکە چۆن و لەچ ئاستێکدا دەبینێ؟.

بەشی سێیەمی ئەو کتێبە بەدوادا گەڕانی وێنەی عەرەب و ئیسلامە لە نێو میدیایی ئەویدیکەدا. واتە چۆن وێنەی عەرەبی لە خۆرئاوا دەشێوێنرێ. پاشان شێواندنی وێنەی عەرەبی چەند پەیوەستە بە ئیسلامو چەند کۆچکردووە عەرەبەکان دەوری تیا دەبینن -لەم بەشەدا (جابری) دەڵێ: هەمیشە ئەوروپاو خۆرئاوا هەوڵدەدەن وێنەی عەرەب وەک تێکدەرو تیرۆریست بکێشن. بۆئەوەی هەموو خەباتە ئازادیخوازەکانی عەرەبی بە تیرۆرو تێکدەر بدەنە قەڵەم. بەو پێیەی کە عەرەب مادەی ئیسلامە. بۆیە خودی ئیسلامیش لەم ناووناتۆرەیە بەدەرنییە، یاخود ئەگەر مرۆڤی عەرەبی بۆ ئەم باسە فریایان نەکەوێت ئەوا ئیسلامی

ئوسولی دەکەنە بابەتی سەرەکی میدیاو لەوێوە ناوی عەرەب و وێنەی خودی عەرەب دەخەنە هەمان رستەوە. خودی ئەو رستەیەش بە شێوەیەکی هونەرییانە وایدەنەخشێنن کە قەناعەتی تاکی ئەوروپی بتوانێ هەرسی بکات. یاخود بە مانایەکی دیکە میکانیزمیەتی عەقڵی ئەوروپیو خۆرئاوایی لە مامەڵەکردنی لەگەڵ ئیسلامدا بەدرێژایی رستەکانی جووڵە دەخاتە هەستی بەرامبەرو ترسێک دەخاتە دڵەوە. وەک ئەوەی کە ئیسلام تاکە ئەویدییەکی بەهێزی (بەرامبەر) بێت.

(جابری) لەم رووەوە دەپرسێو دەڵێ مرۆڤ بەرامبەر میدیاکانی خۆرئاوا دووچاری سەرسامی دەبێ چونکە ئەوان بەرگرییەکانی لوبنان لە دژی داگیرکەری ئیسرائیلی بە راوەدونان لەقەڵەمدەدەن. بەڵام ئەو فیلمە ئەوروپاییانەی کە بەرگری دژی نازییەت نیشان دەدەن هەمیشە بە شێوەیەکی بەرز دەخەمڵێنن. لەوەش زێتر میدیای ئەوروپی کردەوە شەڕانگێزەکان و کارە تیرۆرەکانی کوردی باکوری عێراق و باشوری تورکیا بەخەبات دەدەنە لەقەڵەم.

لێرەدا (جابری) نیازی ئەوەی هەیە کە بڵێ خۆرئاوا هەمیشە دەیەوێت بە شێوەیەکی سلبی وێنەی (عەرەبی/ئیسلام) بخاتە دووتوێی میدیاکانەوە. یان سیناریۆیەک بۆ ئەو مەبەستە دابرێژێ بەو ئامانجەی کە بەدیلی وێنەی شیوعییەت بگەیەنێت. لێرەدا ئەگەر شیوعیەت وەک پانتاییەکی سوور لەسەر نەخشە حسابی (ئەویدی) بۆ کرابێت. گوایە عەرەبی بە (رەنگی سەوز) ئەو دەورەی بۆ دووبارە دەکاتەوە. کەواتە وێنەی عەرەبیو شوناسی عەرەبی بۆ ئەویدی دەکەوێتە دووتوێی ئیسلامی ئوسوڵی لەلایەکو ئەوت لەلایەکی دیکە.

سەرەڕای ئەوەش وێنەی کۆچکردووەکان بە شێوەیەکی سلبی دەگرێ وەک ئەوەی ژیانی ئەویدیکەیان دووچاری قەیران کردبێ. یاخود کۆسپێ بن لە رێگەی پێشکەوتنو داهێنانەکانیاندا. بە کورتی ئەو کتێبە بەرلەوەی کتێبی بیریارێکی عەرەبی بێ ناگانامەیەکی ناسیۆنالیزمی رووتەو هەوڵی لەکەدارکردنی بەخششەکانی ئەویدی بۆ وەجووڵەخستنی منی عەرەبی و گەڕانەوەی مێژووی سەربەرزییەکان و ژیاری عەرەبی دەکات. بێ ئەوەی هیچ حسابێ بۆ ئازادی بیروڕادەربڕینی کەمەنەتەوەییەکان بکات. وەک ئەوەی لەم شوێنگە عەرەبییەدا جگە لە (عەرەبی) شتێکی دیکە وجودی نەبێ. یان جگە لە ئایینی ئیسلامی

ئایینێکی دیکە لە ئارادا ئەبێ. خودی ئەو مەسەلەیەش بۆچوونی (جابری) وەک ناسیونالیستێکی پەرگیر دەخاتە بەر چاو. بەکورتی لەبری ئەوەی جابری وەک ناسیۆنالستێکی پەرگیر خۆی تەرح بکات پێویستە وەک بیریارێکی مۆدێرن قسە لە داهێنانەکانو پێشکەوتنەکان بکات. لەلایەکی دیکەش دەبێ بیرکردنەوەی ئایدۆلۆژی و بیرکردنەوەی مرۆڤایەتی بیرکردنەوەی سیاسییەنەو بیرکردنەوەی ئابوورییانە لەیەکتر جیابکەینەوە. لێرەدا قسە لەوە نییە وەک خۆت نەبیت. بەڵکو قسە لەوەیە ئازادییە مرۆڤایەتییەکان پێشێل نەکەیت. قسە لەوە نییە ناسیۆنالیستانە بیرنەکەیتەوە. قسە لەوەیە. ئەویدیکە لە چاوی داهێنانو پێشکەوتنە مرۆڤایەتییەکان ببینی. نەک وەک ئەویدیکەیەکی دوژمن نەک وەک ئەویدیکەیەکی دەبەنگو بێکردە. هەرچۆنێ بێ دەتوانین بڵێین ئەو کتێبە کۆمەڵێک قسە هەڵدەگرێ بەڵام ئێمە لێرەدا تەنیا ویستمان دەرگا بۆ خوێندنەوەی (جابری) بخەینە سەر پشت تادواجار وەک بیریارێکی پەرگیر بیخەینە ژێر پرسیارەوە..

# ناسنامە کوشندەکان

## چەند خوێندنەوەیەک بۆ زمانی چەمک و بەجیهانیبوون

یەکێک لە گرفتە سەرەکییەکانیمرۆڤ ئەوەیە ئەتوانێ لە ئێستای خۆیدا بژێت. ئەتوانێ بچێتە زەمەنی خۆیەوەو لە ئێستای خۆی تێبگات. ئەتوانێ بە شێوەیەکی مۆدێرن لەگەڵ ئێستای خۆی مامەڵە بکات. ئەوەش وەک چۆن بە جیهانبینی و بابەتەوە پەیوەستە، بەشێوەکەی تیکەش بە زمانی چەمکو عەقڵانییەتەوە دەلکێ.

واتە ئەگەر لە نەبوونی جیهانبینیو بابەتبوون بەمانا هابرماسییەکەی فیکر بکەوێتە فەرامۆشییەوەو سەربەخۆییو ئازادی خۆی لەدەستبداتو نەتوانێ پارێزگاری لە خۆی بکات، لە بێ ئاگابوونەوە فیکری خۆی ون بکاتو نەتوانێ ئامانجی خۆی بنوێنێ. ئەوە وەک بابەتیش خۆی لە شێوەی دال دەکێشێ. واتە لەبری ئەوەی وەک بکەر دەربکەوێت، وەک رەمز ئامانە دەبێت. ئامانجی رەمزییانەش دەکەوێتە سەرووی واقیعو پانتاییەکانی دەلالەتەوە. هەمیشە کردەو ئاگایی عەقڵی دووچاری لەتبوون دەکات. لە رێگەی ئەو لەتبوونەشەوە نامۆیی لە ئاپک دەبێ، یان بە مانایەکی دیکە پەیوەندییە ئەکتیفەکانی تاکو گروپەکان دەکەوێت. بە دیوەکەی دیکەش عەقلانییەت بەرەو ئەگەرە نێگەتیفەکان دەبێتەوە.

## ناسنامەو جیاوازییەکان

مەسەلەی ناسنامە یان شوناس ئەمڕۆ لە تەگەرەو ئیشکالییەتێکی گەورەی فیکریو مەعریفیدا خۆی هەڵدەگرێتەوە یان بە مانایەکی دیکە پرسیارێکە بە پێی باروودۆخو شوێنو ساتە وەختی پرسیارکردنو بەرژەوەندییە جۆراوجۆرەکانو ئاگاییو رۆشنبیرییو جیهانبینییە جیاوازەکان گۆڕانی بەسەرداێ. بەو مانایەش وەک ((جابری)) دەڵێ: پرسیاری ناسنامە هەمیشە پرسیارێکە لەبەرامبەر ئەویدی. یان بە مانایەکی دیکە ئاستی رۆشنبیری کۆمەڵگاو ((ئەویدی)) لە ئێستاو ساتەوەختی ئێستادا سنورەکانی دادەڕێژێ. کەواتە لێرەدا بە ناسنامە جۆرێک لە جۆرەکان تەئکید لە (من)و هێزی (من)و بەرخودانو پەرچەکرداری (من) دەکاتەوە.

(جابری) هەوڵدەدات لە رێگەی تێربوون لە خودو چوونە نێو مێژوو لە بەرامبەر ئەویدی ناسنامەو شوناس بەرزبکاتەوە(١). ئیشکالییەتی ئەو تێزەش بەرەو ئیشکالیەتی بیرکردنەوەی (دیکارت)یمان دەبات. راستە (دیکارت) ناڵێ بیرکردنەوە بەمندا دەڕوا. بەڵکو دەڵێ (من بیردەکەمەوە) فەلسەفەی دیکارت فەلسەفەی رۆحو بونەوەر نییە. بەڵکو فەلسەفەی خودو بوونە. بەومانایەش دنیای دیکارت نە دنیای سروشتەو نە دنیای رۆح. بەڵکو دنیای

مرۆڤە. مرۆڤێک کە گومان دەکات. بەڵام (ئەدمۆند هوسرەل)ی ئەڵمانی هات تاکو بە فینۆمینۆلۆژییەکەی لە بارمتەی (خواوەند) رزگارمان بکات. لە بری ئەوەش کۆمەڵێک ئەزموونی خودی، یان کۆمەڵێک خود، خودێکو خودی ئەویدیکەی هێنایە ئاراوە. هەروەها هۆسرەل ماهیەتی کۆتایی خستە نێو دووکەوانەوە. واتە وازی لە لێکۆڵینەوە هێناو تەنکیدی لەسەر پێکەوە ژیانکرد. یاخود ئەزموون کە ئاگایی خودی تیایدا وجوی هەبێت.

ئەگەر فەلسەفەی دیکارت بڵێ: بە کەفالەتی خواوەند ئەوەی دەیبینم، هەروەک خۆی دەیبینم. ئەوە فینۆمینۆلۆژیای هوسرەل دەڵێ: من بیرەدەکەمەوە، تۆ بیرەدەکەیتەوە، ئێمە گشتمان بیرەدەکەینەوە، ئەوەی لێرەدا گرنگ دەکەوێتەوە بۆ ئەزموونەکانمان پێکەوە ژیانە. کەواتە وازهێنان لە فەلسەفەی خود، هەوڵدانە بۆ فەلسەفەیەک کە بکەر دەوری سەرەکی تیا وازی ئەکات. ئەو فەلسەفەیەی کە واز لە خود دەهێنێ لە چەمکی (ئەپستمی) فوکۆو چەمکی فەلسەفەی بێ سێنتەری (دریدا) دەبینین(٢).بەمانایەکی دیکەش لە چەمکی جیاوازییدا خۆی هەڵدەگرێتەوە کە راستەوخۆ دژی فەلسەفەی ناسنامە بە مانا تەقلیدییەکەی دەکەوێتەوە. یان بە مانا(هیگل) یەکەی چونکە (هیگل) گرینگترین فەیلەسوفی فەلسەفەی تاک ناسنامەیە. بەرامبەر ئەو فەلسەفە تەقلیدییەش ئەمڕۆ مرۆڤ کۆمەڵێک پێوانەی بۆ ناسنامە هەیە. نەک بەو مانایەی کە خاوەنی چەندین ناسنامەیە، بەڵکو بەو مانایەی کە ناسنامە لە چەندین رەگەز پێکهاتووە. کەواتە ناتوانین ناسنامە پارچە پارچە بکەین. بەڵام هەر مرۆڤێک بڕیارێکی تایبەتو جیاوازی لە ناخەوە هەڵگرتووە. ئەو جیاوازییەش جەستەیی نییە. بەڵکو مرۆڤانەیە. نە ئەتنیو نە ناسیونالیست ناتوانێ بیشێوێنێ. ئەو ویژدانە بەمانا تەقلیدییەکە رۆحانی دەکەوێتەوە. ئەو ویژدانە زیندووە هیچ کاتێک بەهۆی خەسڵەتی جەستەیی، یان مۆری پەنجەو مێژووی لە دایکبوون و ناوو رەنگ و درێژی و کورتی باڵا لەکەدار نابێ. ئەو ویژدانە زیندووە هیچ کاتێک نە بە تۆمارە رەسمییەکانەوە بەندە. نە بە ئینتیمای کۆمەڵایەتیو سیاسی و خێڵو گوندو کۆڵان.... راستە هەر یەکێک لەو رەگەزانە مانای خۆی هەیە. هەروەها ئەگەرچی گەلێک تاوان (ئاینی، ناسیونالیستی، ئەتنی....) بەناوی ناسنامە ئەنجام دەدرێ. راستە بەشێکی ئەو تاوانانە بە زاڵبوونی رەگەزێک لە رەگەزەکانی ناسنامە بەندە. بەڵام جیاوازییەکان وەک ویژدانی زیندوو. یان بەمانایەکی دیکە چەمکی جیاوازی، ئەو نیشانەیە کە دەکەوێتە دەرەوەی رەگەزەکانەوە. بە پرشنگی خۆی هەموو رەگەزەکان

ڕووناک دەکاتەوە. بەو مانایەش نە چەمکی جیاوازی و نەچەمکی ویژدان لە نێو گشتێکی نوێدا کۆتاییان پێنایەت. ئەگەر چەمکی جیاوازی لە سیستەمی پلۆرالیدا بژیت. ئەوە چەمکی ویژدان چەمکێکی مرۆڤخوازانەیەو بەردەوام خۆی نوێ دەکاتەوە. ئەگەرچی وەک چەمکێکی تەقلیدی پەیوەست بە ترادیسۆنەکان دەبینرێ. بەڵام ئەگەر لەو مانا تەقلیدییەی بکەینەوە. دەبینین وەک نیشانەیەکی ناوەوەی مرۆڤایەتی ناشێ بۆ تاقە پێناسەیەک کورتی بکەینەوە. وەک چۆن ناشێ بە تەنها بە ئایین و ئەتنی نەتەوەیەکی دیاریکراو پەیوەستی بکەینو بە زەمەنێکی دیاریکراو بەندی بکەین. کەواتە دەشێ چەمکی ویژدان سەرەڕای مانا تەقلیدییەکانی لە نزیک چەمکی جیاوازیدا پرۆسیسە بکرێت و ماناکانی خۆی دەوڵەمەند بکات.

لای هەندێ ئاسنامە نیشتمانە. لای هەندێکی دیکە ئایینە. بەڵام هیچ ئینتمایەک بە شێوەیەکی رەها باڵادەست نییە. هیچ هەڕەشەیەک ناتوانێ ویژدانی زیندووی مرۆڤایەتی و جیاوازییە مرۆییەکان لەکەدار بکات. ئەوەش ئەگەر لەلایەک پەیوەنی بە ئیرادە هەبێت. ئەوە لەلایەکی دیکە پەیوەندی بە پلۆرالییەتەوە هەیە. وەک چۆن هیچ رەگەزێک لە رەگەزەکانی ئاسنامە ناتوانێ ویژدانی زیندوو بڕەوێنێتەوە. بەهەمان شێوەش ناتوانێ چەمکی جیاوازی بخاتە دواوە.

کەواتە چەمکی ئاسنامە ئەمڕۆ بۆ مانا تەقلیدییەکان ناگەڕێتەوە. بەڵکو لە میانی جیاوازییەکاندا خۆی هەڵدەخات پشت بە عەقڵانییەت و مانا هاوچەخەکانی فیکرو مەعریفە دەبەستێت سەرەڕای ئەوەش پەیوەندیی خۆی لەگەڵ چەمکەکان بە شێوەیەکی دیکەی مۆدێرن پەرە پێدەدات. واتە لەگەڵ گۆڕانی زەمەن ئاسنامەش دەگۆڕێ. وەک چۆن هەڵسوکەوتەکانمان بە قووڵی دەگۆڕێن. ویژدانی مرۆڤانەش لەگەشەکردندایە. لەگەڵ جیاوازییەکانیشدا چەمکی ئاسنامە رەگەزە زیندووەکانی خۆی بەشێوەو مەیل و وێنە جیاجیاوە دەخاتە روو. هەرلەوێشەوە پەیوەستبوونی مرۆڤانەمان بە واقیع رادەگەیەنێن کەواتە پەیوەستبوونی مرۆڤانەمان بە واقیع بەدیوەکەی دیکە بەدەر نییە لە پەیوەستبوون بە زمان. ئایین. رەگەز. چین. ناسیونال.. هتد. بەڵام وێڕای جیاوازییەکان چۆن لەو هەموو شتانە نزیک دەبینەوە. چۆن دەتوانین هارمۆنیەتێک لەگەڵیاندا دابمەزرێنین؟

چەمکی ویژدانی مرۆڤانە بەهیچ شێوەیەک تەعبیر لە فۆرمی گشتگیری ناکات. وەک چۆن دەلالەت لە کوشتنی جیاوازییەکان ناکات. چونکە وەک گوتمان چەمکێکە بەردەوام گەشە دەکات. ژیانیش بەردەوام جیاوازی دەخاتەوە. هەموو یەکێک بە جۆرێک لە جۆرەکان لەویدیکە جیایە. هەرکەسێ بە ناسنامەی (ناوێتە)ی خۆیەوە پەیوەستە. بەومانایەش ناسنامە شتێ نییە هەتا هەتایە لەگەڵتابێ. بەڵکو رەنگە بگۆڕێت بۆ نموونە: ئەو رەگەزانەی هەر لە منداڵییەوە بە ناسنامەکانمانەوە لکاون. هەر لە رەنگی قژ. پێست. رەگەز. سیفەتی جەستەیی... هتد. ناشێ تەواو سروشتی بن. بۆ نموونە: (رەگەز) یان بەشێک لە چەمکی (رەگەز) دەوروبەر پێتدەبەخشێ بەپێی شوێنکاتو تێڕوانین بۆ رەگەز واتای رەگەز دەگۆڕێ. رەنگە لە کۆمەڵگایەکی دواکەوتوو رەگەزی (مێ) هەرگیز بەشێوەیەکی مێیانە نەژی. یان رەنگە قولەڕەشێ لە ئەفەریقیا هەمان ناسنامەی قولەڕەشیی نەبێ لە ئەوروپای سپی پێستدا. ئەوە دەلالەت لەوە دەکات کە هەریەکێک لەو سیفەتانە بۆ نموونە: کورتی. دریژی. رەشی. سپی. رەنگی چاو. هەژاری. بێناوکی. شەلی. کۆجی... هتد هەموو جیاوازییەکانی دیکە دەستیان لەدروستکردنی بەشێک لە رەفتارو بیروڕاو هیواو ئاواتو ئامانجەکانمدا هەبێ. وەک چۆن بەدیوەکەی دیکەش دەستیان لە دروستکردنی چەمکی جیاوازییەکانیشدا هەیە.

ئەگەر سەیفەتە جیاوازەکان. یان هەندێک لەو سیفەتە جیاوازانە ببنە هۆی بەرجەستەبوون. یان برینداربوون. هەریەکێکیش لەو بەرجەستەبوونو برینانە ببنە هەڵوێستێک بەرامبەر ئینتماکردن. ئەوە چەمکی جیاوازییەکان ئاسۆیەکی کراوەو نازادانەتر بۆ ئینتماکردن واڵادەکا. هەرلەوێشەوە چەمکی پێکەوە ژیانو مافی تاک هەڵدەگرینەوە.

هەڵوێستی سیفەتە جیاوازەکان بەرامبەر ئینتماکردن وێنەیەک دەکێشێ. رەنگە هەندێ جار ئەو وێنەیە بەرەو ترسمان بەرێت. هەندێجار بەرەو بەرگریکردن و نەتوانین..هتد. بەشێک لەو وێنانەو بەشێک لەو حیکایەتانە لە یادەوەری جێگیر دەبێ. بەڵام خودی ئەو جێگیربوونە راستەوخۆ پەیوەندی بە ئاگایی کۆمەڵگاو مافی تاکو مەعریفەو دەسەڵاتەوە هەیە. یان بە مانایەکی دیکە پەیوەندی بە واقیعی کۆمەڵایەتی و ئابووری و سیاسییەوە هەیە. لە کۆمەڵگا دواکەوتووەکان ئەو جێگیربوونە دەبێتە بە شێک لە رەفتارو بیروبۆچوون. دەبێتە بەشێک لەو رەمزانەی کە لە ئەستدا گل دەبێتەوەو لە کاتی هەڵچوون و حاڵەتە ناسروشتییەکانی مرۆڤ. بەهەمان میکانیزمی بەرگریکردن. یان ترس دەتەقنەوە. کەواتە

مەرگەساتەکانی دنیاو تەواوی هەوڵە جەرگبڕاوەکان و شەڕەکان و تابڕوبردن و تالانکردن و هەموو ئەو شتانەی کە بە شەڕو ترس و بێحورمەتکردنی مرۆڤەوە بەندەو دەستیان لە جێگیرکردنی شەڕانگێزیو شێتی و کوشتن و خۆکوشتندایە. بەشێک لە یادەوەری مرۆڤ پێکدەهێنن (هەرچەندە لەسەرەوە گوتمان بەشێک لەو حاڵەتەو جێگیربوونی پەیوەندی بە دواکەوتنی هۆشیاری کۆمەڵگاوە هەیە) بەڵام لە بیرمان نەچێت هەموو مرۆڤایەتی بەشێک لەو دڕندایەتییەی تیاهەیە. ئەگەر زۆر کەمیش بێت. هەموو مرۆڤایەتی بەشێک لە (مستەر هاید) دەستی بەسەردا دەگرێت. بەڵام گرنگ ئەوەیە بەردەوام ویژدانی مرۆڤانەمان وریا بکەینەوە. زۆرجار ناسنامە کوشندەیی لەپەرگیری بەرچاو دەکەوێت. بەومانایەش ناسنامە لەبەها مرۆییەکە رووت دەکاتەوەو هەموو جیاوازییەکان سەردەبڕێت و بەرەو تاک نێتتیمیان دەبات و (مستەر هاید) لە ناوەوەماندا زیندوو دەکاتەوە. هەموو ئەو خوێنڕشتنەی سالانەی دوایی. هەموو ململانێ خویناوییەکان بە دۆسییەکانی ناسنامەوە بەندە. دۆسییە ئاڵۆزو کۆنەکان دەستیان لەو خوێنڕشتنەدا هەیە. زۆرجاریش خوێنڕێژەکان دەبنە خوێنڕژاو.... هتد.

بۆ ماوەیەکی زۆر بەندایەتی وەکو واقیعی ژیان سەیردەکرا. هەتا عەقڵە گەورەکانیش نەیانتوانی چاوێک بەو واقیعەدا بخشێننەوە. کەواتە لێرەوە دەتوانین بڵێین بەشێک لە ناسنامە کوشندەکان (بکوژەکان)(٢) راستەوخۆ پەیوەندییان بە هۆشیاری سەردەمەوە هەیە. هەندێکجار حەقیقەتەکانی سەردەم زوو دەردەکەون. هەندێکجار دوادەکەون. بەڵام گرنگ دەرککردنیانە . نابێ بەهەمان هەڵوێستی کۆن رووبەڕووی ئەمڕۆ ببینەوە. بەردەوام پێویستە چاو بە شتەکاندا بخشێنینەوە. جیاوازییەکان فەرامۆش نەکەین و ویژدانی مرۆڤانەمان وریا بکەینەوە. رووە تاریکەکەی عەقڵ بە ئیرادەی مرۆڤانەمان زیندەبەچاڵ بکەین. پێویستە بەردەوام چاو بە بەرهەمەکانی مرۆڤ و عەقڵ و مەعریفەدا بگێڕینەوەو رەخنەیان لێبگرینو بە دوایاندا بچین. وەک ئامرازێکی بێلایەن لە عەقڵ نەڕوانین. وەک چۆن پێویستە مرۆڤ لە شێوە رەهاکە داماڵین چونکە لە پیشت ئەو فۆرمە باڵاو رەهاو پەرگیرانە. لەپشت ئەو جۆرە لە سینتەرو گشتگیرییە. شێوازێکی دیکەی مەعریفەو فیکرو ئەگەرو کۆمەڵێک پرسیاری بێدەنگکراوو نەفیکراوو بە پەراوێزکراو هەیە کە پێویستە بیاندۆزینەوە.

# بە جیهانیبوون و ناسنامە

بە جیهانیبوون رستێک پرۆسەی یەکانگیرو تێکچرژاوە، خۆی لە بزاڤو بیرو سەرمایەو زانیارییەکان بەرجەستە دەکات و هەر لەوێشەوە دەلالەت لە ئابووری ئەلکترۆنی و ڕاگەیاندن و بوارەکانی تەلەفزیۆن و ئەو واقیعە دەکات کە لە دەرئەنجامی شۆڕشی زانیارییەکان سەرچاوە دەگرێ .

لە سەردەمی بە جیهانیبووندا ملیۆنان دەبینین لە نێوان جەختکردنی ناسنامەو ونبوونی ناسنامەدا دەژین، لە نێوان ئوسولییەت و هەڵوەشاندنەوەی ئیختیارەکان. تەواوخۆیان ونکردوە، بەڵام دەبێ بزانین کە بە جیهانیبوون وەک گۆڕانکارییەکی مێژوویی، یان بەخشیش تەکنەلۆجیا، مەترسی بابەخەکەی لەسەر چۆنییەتی مامەڵەکردن وەستاوە. کەواتە پێویستە دەرگا لە ناسنامەکان بکەینەوە پێویستە جیاوازییەکان وەک جیاوازی تەماشا بکەین، دەرگا لە ڕەگەزەکانی پێناسە بکەینەوە، دەبێ بزانین کە ویژدانی زیندوو لە فرەرەنگی دایە، یان بەرجەستەکردنی ڕەنگێک بەسەر تەواوی ڕەنگەکانی دیکە، یان بەرجەستەکردنی تەنیا ڕەگەزێک لە ڕەگەزەکانی ناسنامە، چونکە ڕەتکردنەوەی ئەویدی دنیاییەک وێنە دەکات کە ستەم تیایدا باڵا دەستە، دنیایەکی تۆتالیتێر، دنیایەک کە پێویستی بە بەرەیەک لە ستەمکارو خوێنڕێژ هەیە، ئەمڕۆ ئەو بیرکردنەوەیە، بیرکردنەوەیەکی میتۆلۆژیانەیە، بیرکردنەوەیەکە پشتبەست بە حیکایەتە گەورەکان. ئەو جۆرە لە بیرکردنەوە ڕاستەوخۆ دەلالەت لە فەرامۆشکردنی جیاوازییەکان دەکات، ئیرادەو هێزی مرۆڤ دەخاتە پەراوێزەوە، ڕاستەوخۆ فەرامۆشکردنی ئیرادەو ئیبداعە.

(ئەمین مەعلوف) دەڵێت: تاوانێک کە بەناوی بیرورا دەکرێت، خودی بیروراکە تاوانبار نییە، چونکە (دەق) کار لە حەقیقەتی دنیا ناکات، تەنها لە دووتوێی بۆچوونی ئێمەوە نەبێت، لەهەرسەردەمێکدا چەند رستەیەک دەڕوا، چەند رستەیەک کە نایبینین، ئەو لایەنەی کە دەمانەوێت بەرجەستەی بکەین، ئەگەر بەشێکی پەیوەندی بە زمانی چەمکو رۆشنبیرییەوە هەبێت، بەشێکی ڕاستەوخۆ پەیوەندی بە یادەوەرییەوە هەیە، بەڵام چۆن دەتوانین لەدەرەوەی یادەوەرییەوەمیە لە ڕێگەی دووبارە فۆرمەلەکردنی پێکهاتەکانی فیکرەوە

خوێندنەوەی جۆراوجۆر ئەنجام بدەین. دەشێ ئەو پرسیارە دەرهاویشتەی ئەو بۆچوونەی (ئەمین مەعلوف) بێ کە دەڵێ: چۆن دەتوانین بڵێین (پۆل پۆت) پەیوەندی بە مارکسییەوە نییە. رژێمی (بینۆشیە) پەیوەندی بەمەسیحییەتەوە نییە. پاشان دەپرسێ ئایا بە راستی لە مەسیحییەت لێکبووردن هەبووە. مەسیحییەت رێزی ئازادی گرتووە. دیموکراسی بووە. با بۆ ئەمە کتێبە مێژووییەکان هەڵدەینەوە. چەمکی (لێبوردن)(٤) پەیوەندی نێوان لێبوردەو لێبوراو دەسەپێنێ. ئەوەی ئەو پەیوەندییەش رێکدەخاتەوە جگەلە (هاوسەنگی) هێز شتێکی دیکە نییە. واتە چەمکی لێبوردن هیچ کاتێک رێزگرتنی ئەو بیرڕایانە ناگرێتەوە کە ناکۆکن لەگەڵیاندا. بەڵکو ئێمە لە یەکێک دەبووریین کە ناتوانین رێگەی لێبگرین. ئەوەی کە دەشبوری لاوازە. دەشێ کاتێک بەهێز بێت بە پێچەوانەوە نەبووری. دووبارە با کتێبە مێژووییەکان هەڵدەینەوە. چەندین چەوساندنەوەو ئازاردان و کوشتن و برین و حورمەت شکاندنی مرۆڤانەمان بەرچاو دەکەوێت کە بەناوی ئایینەوە کراوە. زۆرجاریش پەیوەندی بە رەگەزی ئایینەوە نییە. بۆ نموونە حاڵەتی (ستالینی) کەدژ بە ئایینە -یان نازییەت کە رەگەز پەرستییەو ئایین فەرامۆش دەکات. هەروەها (ئەمین مەعلوف) لە کتێبی **[ئاسنامە کوشندەکان- چەند خوێندنەوەیەک بۆ ئینتماو بەجیهانیبوون]** پێیوایە پێکەوە ژیانی مەسیحی و موسوڵمانان لێکبووردن دەگەیەنێت. بەڵام لە بیری چووە کە وشەی کاسۆلیک لە مانا زمانەوانییە یۆنانییەکەیدا واتای (سەرتاپاو گشتی و جیهانی) دەگەیەنێت. پاشان ئەو کاتەی مەیلی ناسیۆنالی لە ئەورووپا لەهەرەتدابوو **[لێکبووردن]** ملکەچی بەرژەوەندییەکانی **[ناسیونال]** کرابوو.

(تۆماس) دەڵێت: لێکبووردن لەگەڵ لێکنەبووردن ناکۆک ناکەوێتەوە بەڵکو سەرەوژێرکردنیەتی. هەردووکیان جۆرێکن لە زۆرداریو کەڵەگایی. یەکەمیان مافی ئازادی و ویژدان بەخۆ دەبەخشێ و دووەم رێگا بەخۆدەدا پەردەپۆشی بکات.

دواجار راستە (ئەمین مەعلوف) تەرجەمەی نموونە دژەکان دەکاتو دووفاقییەتی (لێکبوردن/دژەلێکبوردن) دەخاتە روو. بەڵام ئەمڕۆ پرسیار ئەوەیە ئایا ئەو چەمکە لەکام بواردا خۆی دەدۆزێتەوە ئایا راستەوخۆ بە کایە سیاسییەکەوە پەیوەست نابێ. پاشان چۆن دەشێ لەدەرەوەی ئێرادەی تاکەوە قسە لە لێبوردن بکەین. چۆن دەشێ جیاوازی

بارودۆخەکان فەرامۆش بکەین لە بیریشمان نەچێ هێز ((دەوڵەت، نیشتمان، حیزب...)) کاتێ لێبوردن دەخاتە روو، لەهەمان کاتدا دژە لێبوردنیش پراکتیزە دەکات.

کەواتە قسەکردن لە لێکبوردن بۆخۆی دەلالەت لە کەڵەگایی دەکات، ئەوەی جێگای قسەکردنە ئەوەیە کە لەدەرەوەی (لێکبوردن و لێکنەبوردن) وەک هاولاتی سەیری مرۆڤ بکەین، مامەڵەیەکی مرۆڤیانە لەگەڵ یەکتردا بەئەنجام بگەیەنین، پێویستە هاولاتی تەواوی مافەکانی پارێزراوبێ، جا موسوڵمان بێ یان کافر، پرسیار ئەوە نییە کامە رەگەز لە رەگەزەکانی ئاسنامە بۆچوونە ناو ژیان و بەجیهانیبوون بەرجەستە بکەین، بەڵکو پرسیارەکان لە ئێرانەی تاکو ئێرانەی دەستەجەمعییەوە بەرز دەبێتەوە، ئەو پرسیارانەی کە پێشکەوتنی خۆرئاواو دواکەوتنی خۆرهەلات دەخاتە روو.

خۆرئاواو تاکی خۆرئاوایی ئەو کاتەی کە ئێرانەو خواستەکانی خۆی پراکتیزە دەکردو بە فۆرمەلەکردنی فیکرو مەعریفەوە خەریک بوو، ئەوکات خۆرهەلات بە ئاراستەیەکی پێچەوانە دەرۆیشت، جیهانی ئەمڕۆ، ئەگەرو رووداوەکانی بۆ ساتەوەختی نامەزراندن دەگەڕاندەوە، کاتێک قسە لەوە دەکەین کە خۆرئاوا پێشکەوتووە، بەلام خۆرهەلات (سەلەفیەت) بێهیوایە، لێرەوەیە کە خۆرئاوا بەو هەموو مێژووە خوێناوییەی بەو هەموو رەگەزپەرستییەی بەو هەموو تۆتێلیتێرو بەو هەموو وێنە نابووت و ناشرینانەیەوە رێزی مرۆڤ و مافەکانی مرۆڤ و ئازادی بەرزدەکاتەوە، بەلام ئیسلام کەخۆی بە کانگای ژیان و ژیاری دەزانی کەچی لەوپەڕی پەرگیریدایە، هەر لە سەیرکردنی ئەو مەسەلانەشەوە ئەو پرسیارەمان بیردەکەوێتەوە کە ئایا ئایین دەشێ لەگەڵ مرۆڤ رێبکات، گەل چۆن کەوتە ژێر کاریگەری ئایین، شیوعییەت چی لە روسیا کرد، روسیا چی بەسەر شیوعییەت هێنا، ئەو رستانە لە کتێبەکەی (ئەمین مەعلوف) ئەوەمان پێڕادەگەیەنێ کەدەشێ هەموو ئیشکالییەتەکان، هەموو جیاوازییەکان بەشداری لە پێشکەوتنی فیکردا بکەن، دەشێ ئەرکی خۆمان لە زەمەنی خۆیدا رابگەیەنین، بەلام کاتێ دەبێ بۆ ئایین بگەڕێنەوە، ساتەوەختی نامەزراندن، کاتێ سنورێکی سور بۆ شیوعییەت دادەرێژرێ، کاتێ فیکر دەخرێتە چوارچێوەیەکەوە، مەعریفە بە رەها تەماشادەکرێ، ئیتر تراژیدیاکە دەستپێدەکات، ئیتر بزاڤەکان لە گۆدەکەون، گۆڕانکارییەکان بە بنبەستبوون دەگەن، ئیتر شتێ نییە پێی بگوترێ

جیاوازی و فرەڕەنگی، پێی بگوترێ داهێنان و بیروڕای جیاواز. ئیتر لێرەدا هەژاری خوێندنەوەو کەمخوێنی مەعریفە  بە دیاردەکەوێت. ئیفلیجبوونی فیکر بەرجەستە دەبێت.

ڕاستە ڕووناوەکانی دنیا دیارنین. بەڵام کۆمەڵگایەکی دۆگماخواز. کۆمەڵگایەکی هەژار بەرامبەر کەمترین و بچووکترین ڕووداوو ئەگەرچی لەدەستدێ. هەرگیز بەرەوپێشچوون پەیوەندی بە ئایینەوە نییە. تۆ ناتوانی بڵێیت خۆرهەڵات (جیهانی ئیسلامی) بۆیە پێشناکەوێ چونکە موسوڵمانن و خۆرئاوا بۆیە پێشدەکەوێت چونکە مەسیحییە. بەڵکو پێشکەوتن پەیوەندی بە ئیرادەی تاکو داهێنان و ئیرادەی دەستە جەمعییەوەیە. ئایا مەسیحییەت خۆرئاوای نوێکردۆتەوە. ئایا نوێکردنەوە لەگەڵ ئایین دژ ناکەوێتەوە. ئایا نوێکردنەوە تەواو دەرچوون نییە لە ساتەوەختی دامەزراندن و سنوورە داڕێژراوەکان؟

ئاسنامە بەردەوام بەهۆی ڕەنگەکانەوە تەعبیر لەخۆ دەکات. بەهۆی فرە ڕەنگییەوە ڕوناکی خۆی دەبەخشێ لە ڕێگەی فرە ڕەنگی و هاوگونجانی ڕەنگەکان هارمۆنییەت دروستدەکات. ئەمڕۆ ئاسنامە بەقەد ئەوەی دەرئەنجامی پەیوەندییەکی کراوەو پڕبەخشش و پڕکردنەوە لەگەڵ ئەویدیکە. بەقەد ئەوەی تەعبیر لە مانا بەرفراوانەکەی ژیان و ڕێکخستنی ژیان دەکات. ئەوەندە بە تاک مانایی تاک ڕەنگی و دەلالەتەوە پەیوەست نییە. ئەوەی کە تاکی خۆرئاوایی لە خۆرهەڵاتی جیادەکاتەوە قبوڵکردنی جیاوازییەکانە. کەواتە بە جیهانیبوون تێکشکاندنی ئەرگزییەتی ڕۆشنبیرییەو کرانەوەی ئاسۆ نوێیەکانی بەیەکگەیشتنی مرۆیە. بەپێوەکەی دیکەش قسەکردن لەسەر بە جیهانیبوون  قسەکردنیشە لەسەر کۆی ئەو چەمکانەی کە سەرەوژێرکراون. یان کە گۆڕانێکی یەکلاکەرەوەو بەرفراوانی بەسەرداهاتووە. بەو مانایەش بەجیهانیبوون ئیرادەو ئیبداعەو تەعبیر لە ڕۆحی سەردەم و ویژدانی زیندووی مرۆڤانەمان دەکات.

ئەوەش مانای ئەوە نییە کە بەرەوپێشچوون بێئیشکالییەتە. بەڵکو بەو مانایەیەکە بەرەوپێشچوون هەموو ڕەنگەکانی قبوڵە. کەواتە بە جیهانیبوون ئەو بزاف و کرانەوەو هاوگونجانە لەبنەهاتووەیە کە بەردەوام بەرەو گۆڕانمان دەبات. پاشان بەجیهانیبوون هەرتەنها ئەوە نییە کەچۆن خۆمان بگونجێنین. خۆی ئەوە گرفتە. بەڵام لەپاڵ ئەوەش گرنگ ئەوەیە چۆن دەتوانین ڕەگەزە زیندوو مردووەکانی کەلەپور لێکجیابکەینەوە. چۆن دەتوانین ڕەگەزە زیندووەکان لەگەڵ ڕۆحی سەردەم بگونجێنین. ئایا هیچ تازەگەرییەک دەتوانی لە

بۆشایی هەڵقوڵێ؟ کەواتە تۆ بۆنەوەی بڵێیت (هەم) پێویستت بە پانتاییەک هەیە لەسەری بوەستی. بەو مانایەش گەڕانەوە بۆ ناسنامە گەڕانەوەیە بۆ خود. بەڵام خوێنێکی دۆگما. خوێنێک کە هەموو جوڵەکانی. هەموو حەزەکانی کۆنترۆڵ کرابێ. خوێنێک کە سنوورێکی دیاریکراوی بۆ داڕێژرابێت. بەرامبەر کۆمەڵێک پیرۆزی کرابێتەوە دەبێت لەو هەموو فرە ڕەنگییە چاوەڕوانی چی لێبکەیت. بەرامبەر ئەو هەموو پێشکەوتنە خێراییانە چۆن دەوەستێ. بەو هەموو هەژارییە چۆن دەتوانێ بیرکاتەوە. لە بیرمان نەچێ هەموو سنوردانانێک بۆ جوڵەکانی مرۆڤ دواجار سنوردانانێکیشە بۆ بیرکردنەوە. دەست بۆنەبردنی هەموو حەرام و قەدەغەو پیرۆزییەکان دواجار دەستبۆنەبردنی فیکرو عەقڵە. هەرخوێنێک کە نەتوانێ تەجاوزی سنورەکانی حەرامو پیرۆزی بکات. نەتوانێ بجوڵێتەوە. چۆن دەتوانێ بەشداری پێشکەوتنەکانی دنیا بکات. ئازادی و بیرکردنەوەی ئازاد لەوە دایە کە بتوانێ هاوگونجانێ لەگەڵ بەرامبەر بسازێنێ. نەک بە دابڕاو پەرگیری بمێنیتەوە. کاتێ دوورە پەرێزو پەرگیرو دابڕاو دەبیت هەمیشە هەست بە بێهێزی و بێهیوایی و کپبوون دەکەیت. وەک ئەوەی هەموو ئەو شتانەی لەدەرەوەی سنورەکانی تۆ دەکرێت هیچ پەیوەندی بە تۆوە نەبێ. ئالێرەو هەریەک لە ڕەگەزەکانی ناسنامە بەرەو لایەک پەلکێشمان دەکاو دنیایەک ناکۆکی لە ناوەوەماندا دروستدەکاتو کەسێتیمان پارچەپارچە دەکات. بەردەوام داهەستدەکەیت ناسنامە هەڕەشەی توندی لەسەرە. بەردەوام داهەستدەکەیت کە لە وڵاتێک دەژی ئەویدی داگیری کردووە. بەڵام پرسیار ئەوەیە چۆن ئێمە بتوانێ وێڕای کەلتوری خۆمان. بێ ئەوەی بۆ ڕەگەزە مردووەکانی ناو کەلتوری خۆمان بگەڕێینەوە. ئیتتمانی کەلتوری ئەویدیش بکەین. تۆ هەرگیز ناتوانی تەواوی کەلەپوری خۆت بەمردوو دابنێیت. چونکە بەردەوام لەگەڵ کۆمەڵێک ڕەگەزی زیندووی کەلەپوردا دەژی. ئەوە ڕەگەزە زیندووەکانن بەشێک لە تاریکی داهاتووت بۆ ڕوناک دەکاتەوە. ئەوە ڕەگەزە زیندووەکانن لەگەڵت ڕێدەکەن. کەواتە نابێ هەرگیز سڵ لەوە بکەیتەوە کە بەشێک لە پێشکەوتن دەستێکی تۆشی تیایە. هەرگیز نابێ بە پێشکەوتن نامۆ بین. وەک ئەوەی تەنها ئەویدی بەرهەمی هێنابێ. گرنگ ئەوەیە تۆ سنورەکانت بشکێنی و تەجاوزی قەدەغەکراوەکان بکەیت. گرنگ ئەوەیە تۆ بە ئازادی بیرکەیتەوە. نەک لە دووتوێی سنورێکی دیاریکراو چونکە ئەگەر بە ئازادی دەست بۆ شتەکان نەبەیت. چۆن دەتوانی تێبگەیت. کاتێ ئەتوانی

له هەموو شتەکان بگەیت چۆن دەتوانی راڤەیان بکەیت، راستە ئەم رستەیە جۆرێکە له بەکارهێنانی عەقڵانییەت، بەڵام هەرگیز بە مانای ئەوە نییە کە دەلالەت له تەواوی عەقڵمان بکات وەک ((شتروا‌س)) له ((الاسطورة المعنی))دا(٥) ئاماژەی بۆ دەکات، چونکە هەریەکێک له خۆرهەڵات و خۆرئاوا، هەریەکێک له ئێمە بەهەموو جیاوازییەکانییەوە بە پێی پێداویستییەکانمان برێکی دیاریکراو له عەقڵ بەکاردەهێنین، یان دەبێتە شوێن بایەخمان، (شتراوس) هەر له خودی ئەو تێزەوە پێیوایە هیچ جیاوازییەک له نێوان بیرکردنەوەی بەراییو عەقڵی هاوچەرخدا نییە، کەواتە گرنگ ئەوەیە ئاستی پێداویستییەکان له رێگەی نیبداعەوە بەرزبکەینەوە، کاتێ ئاسنامە دەتوانێ بوونی خۆی نیشان بدات کە هەڵگرانی دان بە رەسانەیەتی دابنێن، چونکە تەنها له ژێر هەلومەرجی پەیوەندیدا دەتوانێ شتێک بەرهەمبهێنێ، نەک وەک بوونەوەرێکی بەرهەمخۆر، بۆئەوەی له بەجیهانیبوون بەشداربێت دەبێت کۆمەڵێک پەیوەندی جۆراوجۆر لەگەڵ ئەویدی بسازێنێ، دەبێ لەگەڵ رۆحی سەردەمدا بژیت، ئەوەی سڵ له تواناکانی خۆی دەکاتەوە، دابڕاو پەرگیرە، سنورێکی دیاریکراوی بۆ بیرکردنەوە هەیە، ئاراستەکانی بیرکردنەوەی دیاریکراوو کۆنترۆڵکراوە، ناتوانێ بەتەواوی بیربکاتەوەو بە ئازادی بژی.

## بیرکردنەوەی ستوونی و بیرکردنەوەی ئاسۆیی

ژیان جیاوازییەکان دروست دەکات، ئاسنامەش له یەکێکەوە بۆ یەکێکیتر دەگۆڕێ، تۆ ناتوانی وێڕای رەگەزە زیندووەکان بەردەوام بیر له رەگەزە مردووەکانیش بکەیتەوە، بەڵکو بۆئەوەی زیندوێتی خۆت بەرجەستە بکەیت، دەبێ بەردەوام چاو بە رەگەزە زیندووەکاندا بخشێنیتەوەو راڤەیان بکەیتو رەخنەیان لێبگریت، رەگەزە زیندووەکان هەر تەنها له لێکدانەوەو راڤەکردن و رەخنەوە دەتوانێ بدرەوشێنەوە، کەلەپووریش کاتێ دەتوانێ هەڵگری چرای مەعریفە بێ کەرەگەزە زیندووەکانی دەرئەنجامی جۆراوجۆر بەرهەم بهێنێتەوە، هیچ کەلەپورێ له دنیادا نییە تەواو مردوو، هەروەک چۆن تەواو زیندووش نییە، بەڵکو له راڤەکردنو لێکدانەوەو رەخنەو بۆچوونی ئێمەوە دەجوڵێ، ئەوە رەگەزە زیندووەکانی

کەلەپور نییە ناسنامە دەوڵەمەند دەکات. ئەوە رەگەزە زیندووەکانی کەلەپور نییە بەرەو گۆڕانمان دەکاتەوە. ئەوە بزاف و داهێنانی ئێمەیە بەشە زیندووەکەی کەلەپور دووبارە دەکاتەوەو بەشێوەیەکی دیکە بەرهەمی دەهێنێتەوە. ئەوە خوێندنەوەو بیرکردنەوەی ئێمەیە دەتوانێ رووە پەنهانەکانی کەلەپور ئاشکرا بکات. ئەگوتراوەکانی بخاتە بەر خوێندنەوەی جۆراوجۆر.

ئەگەر بیرکردنەوەی ستوونی پەیوەندی بەو رەگەزانەوە هەبێ ، ئەگەر کەلەپور دەلالەت لەو پانتاییە بکات کە لەوێوە توانای ئێمە بۆ بەشدارییبوون لە جیهانگیری دیاری بکات. ئەوە بیرکردنەوەی ئاسۆیی لە سەردەمو هاوچەرخەکانمانەوە پێماندەگات. راستە بیرکردنەوەی ئاسۆیی کاریگەرترو گرنگترە. بەڵام لە بیرمان نەچێ دواجار هەر زیندوویێتی و داهێنانی ئێمەیە ئەو دیاری دەکات. کەلەپوری مردوو دەلالەت لە گەلێکی مردوو دەکات. راستە ئێمە لە هاوچەرخەکانمانەوە نزیکترین وەک لە باب و باپیرانمان. بەڵام بێناسنامەی تایبەت بە خۆت بێداهێنان و کردەی مەزن ناتوانی بەشداری لە بەجیهانیبوون بکەیت. ژیان لە بونیادەوە سەچاوە دەگرێ. خوێندنەوەی ئەو بونیادەو بەدواداچوونی ئەگوتراوەکانی و رەخنەگرتن و لێکدانەوە بزاڤی بیرکردنەوە بەجەستە دەکات. هەڵوەشاندنەوەی ئەو بونیادەو تەجاوزکردن و داهێنان. گۆڕان دەگەیەنێت. تۆ لە میانی گۆڕانەوە دەتوانی بەشداری لە بەجیهانیبوون بکەین. وەک چۆن لە میانی خوێندنەوەی جۆراوجۆرەوە بزاڤی بە بیرکردنەوە دەدەیت.

کەواتە چەند بتوانین پرۆسەی گۆڕان بەرەو پێش ببەین هێڵەکانی لێکدابڕانی ناوەکیو رەگەزە مردوو زیندووەکان زێتر بەدەردەکەون. ئەوەی لە ئاستێکدا بەدی دێ لە ئەویدیکە وێ دەبێ. ئەوەش تەواو لەگەڵ ناسنامەی سەردەم ، لەگەڵ فرە رەگەزی یەکدەگرێتەوە. بەو مانایەش ناسنامە هەروەک چۆن بەبێ فرەجۆری ناوەکی ناتوانی لەگەڵ ئەویدی هاوگونجانێ دروستبکات. بەهەمان شێوەش بەبێ گۆڕان ناتوانی بەشداری لە بەجیهانیبوون بکات. ئەمڕۆ هیچ رەگەزێک لە رەگەزەکانی ناسنامە ناتوانێ وەڵامی پێداویستییەکانی سەردەم بداتەوە. هیچ پەرچەکردارێ چ ئایینی بێ. یان نەتەوەیی... ناتوانێ هاوگونجانێ بسازێنێ. ئەمڕۆ زەمەنی ئایین لەوەدا نەماوە بۆ ساتە مێژووییەکان بگەڕێتەوە کە تەجاوز بکرێ. هەروەک زەمەنی ناسیونالیستی بەسەرچووە. زەمەنی

پرولیتاریا نابەزیووە. کەواتە ئەو پرسیارەی ناتوانین لێی رابکەین: ئایا دوای تەجاوزکرنی ئەوانە چی دێ؟ تەجاوزکردنی ئینتیمای ئایینی هیچ کاتێ تەجاوزکرنی ئایینی ناگەیەنێت، هەروەک تەجاوزکردنی ئینتیمای نەتەوەیی تەجاوزکردنی نەتەوە ناگەیەنێت..... بەهیچ جۆری ئایین بۆ فەرامۆشکراوە مێژووییەکان ناگەڕێتەوە. چونکە هەرچەندە زانست بەرەو پێشەوە بڕوات پرسیاری نوێ لە ئایک دەبێ (ئەمین مەعلوف) دەڵێ: ئەگەرچی دوای هەزار ساڵی دی ئەو ئایینەی کە ئەمڕۆ دەیناسین ئەمێنێ. بەڵام هەرگیز بە خەیاڵما ناناپەت دنیا بێ شێوەیەک لە شێوەکانی ئایین بێ. من بڕوام بەوە هەیە کە داهاتووی ئێمە ئەنوسراوەتەوە. داهاتووی ئێمە ئەوەیە کە لێیەوە دروست دەبێ. دنیا وەک شەمەندەفەر لەسەر سکەی خۆی بەرەو پێشەوە دەڕوا کەس ناتوانێ لەو ڕێچکەیەی لابدات. جاچ هەموو شتێ رەفز بکاتەوە. یا بێ جیاوازی هەموو شتێ هەڵبلوشێ. کەواتە رەنگە بە جیهانیبوون بەرەو باشترمان بەرێ. ئەگەر هۆکاری نوێ لە نێوان مرۆڤەکان پەرەی پێبدرێ. ئەگەر هەمەرەنگیو جیاوازییەکان تەئکیدیان لەسەر بکرێتەوە.

راستە بە جیهانیبوون کۆمەڵێک ئیشکالیەتی لەخۆ هەڵگرتووە. بەڵام ئەوەی لە بەجیهانیبوون دەترسێ. لە گۆڕانکاریش دەترسێ. دەشێ ئەو رستەیەی ((مەعلوف)) بە جۆرێکی دیکە تەرجوومە بکەینو بڵێین ئەوەی لە رەگەزە جیاوازەکانی ناسنامە دەترسێ، ئەوەی لە فرەرەگەزی دەترسێ بێگومان لە داهێنانیش دەترسێ. کەواتە ئیشکالییەتی بە جیهانیبوون هەرئەوە نییە کە (هولیود) دنیای داگیرکردوە. بێکاری لە زیادبووندایە. بەشێک لە تەعبیرە مۆسیقییەکان کاڵبوونەتەوە. ئاوێتەبوونی نێوان فیکرەکان وەک بۆچوونێکی گشتی ساکار تێدەپەڕێ. بەڵکو بەجیهانیبوون لەو کاتە تەواو سلبی دەکەوێتەوە کە یارمەتی هەژموونی هێزو کۆنترۆڵکردنی رەنگەکان بدات. ئەو کاتە تەواو سلبی دەکەوێتەوە کە چوارچێوەیەکی دیاریکراوی خۆی هەبێ.... کاتێ ئەمەریکا بەناو بەجیهانیبوون دنیا داگیردەکات کەلتورە جیاوازەکان، زمانەکان، زاراوە، ناوچەییەکان چییان لێدێ ....

لەم حاڵەتەی کە هەموو پەچەکردارێک کۆنە پەرستانەو توندرەوانە دەخەملێنرێت. کاتێ دەمێنت تەواو دەستبەرداری خۆت بیت تاکو بتوانی لەگەڵ تازەگەریدا رێ بکەیت. ئیتر مرۆڤ تەواوی مافەکانی خۆی لەدەست دەدات. ئیتر شتێک نییە بەناوی ئازادی بەناوی دیموکراسییەت. ئیتر ئیمکانییەتی ژیان دەکەوێتە بار هەڕەشەوە ئازادیو دیموکراتییەتەوە.

کەواتە بۆنەوەی بیرکردنەوەی ئاسۆیی لەکەدار نەبێ پێویستە زیتر تەئکید لە مافی مرۆڤ و ئازادی دیموکراسیەت بکەین. بۆنەوەی بیرکردنەوەی ئاسۆیی بە جیهانیبوون حەقی بیرکردنەوەی ستونی نەخوات. پێویستە بەدەوام ویژدانی زیندووی مرۆڤانەمان هۆشیار بکەینەوە. نەک بەناوی رۆحی سەردەم فەرامۆشیان بکەین. تۆ ئەگەر بڕوات بە مافەکانی مرۆڤ بێ و فرەرەنگی قبوڵ بکەیت لە دنیادا شتێ نییە بۆ جولەکەیەک رەوابێ کەچی بۆ موسوڵمانەکە رەوانەبێ. بۆ خۆرئاواییەک سروشتی بێ. کەچی بۆ خۆرهەڵاتییەک ناسروشتی.

## پرنسیپی ئاڵوگۆڕی و ناسنامە

ئێمە هەرلە سوکراتەوە فێربووین کە پێویستە خۆمان بناسین تا لە ڕێگەی ناسینی خۆمانەوە ئەویدیکەش بناسین. کاتێ ئەتوانین رەگەزە جۆربەجۆرەکانی ناسنامەی خۆمان قەبوڵ بکەین. کاتێ ئەتوانین لە ڕێگی تایبەتمەندیو ئاهێنانی خۆمانەوە بەشداری لە ژیان بکەین. کاتێ ئەتوانین لە ڕێگەی خوێندنەوەو بونیادنانەوە ئاوێتەی ئەویدی ببینو دواجار بەشێک لە کەلەپوری هاوبەشی مرۆڤایەتی پێکنەهێنین. کاتێ رایەڵێک نییە پێکەوەمان ببەستێتەوە. ئامۆیی کرمۆڵمان دەکات هەستدەکەین ناسنامەمان کەوتۆتە بەر هەڕەشەی ئەویدیکەوە. جابۆنەوەی نەکەوێتە پەراوێزەوە پێویستە پرنسیپی ئاڵوگۆڕی پەیڕەو بکەیت. پێویستە بڕوات بە فرەرەنگی ناسنامە هەبێ. لەبەرئەوەی دنیا ڕێگای داوە پارێزگاری لە کەلتوری هەڕەشە لێکراو بکەین. ئیتر بۆ دەبێ سود لەو دەرفەتە وەرنەگرین. دنیا بۆکێیە؟ بۆ ئەتنییە . یان ناسیۆنالیزم. بۆ..... هەرگیز شەمەندەفەری ژیان بەرەو دواوە ناگەڕێتەوە. کەواتە دنیا بۆ ئەوانەیە کە هەوڵدەدەن بگەنە ڕێسای ئەو یارییە نوێیە. بابێ سڵکردنەوە لە میانی پرنسیپی ئاڵوگۆڕی بەشداری بکەین. چونکە بە جیهانیبوون شێوازێکی نوێیە بۆ ژیان سیستەمێکی نوێیە لە هەموو لایەکەوە کراوەتەوە. هەزاران جەنگو ململانێ و زۆرانبازی تیا ئەنجام دەدرێ. لەهەمان کاتیشدا ڕێگا لەکەس ناگیرێ. هەموو کەس بۆی هەیە بچێتە ناوییەوە (بۆ نموونە ئینتەرنێت) گرنگ ئەوەیە بەر لەوەی بکەوێتە پەراوێز.

بەرلەوەی لەناو بچیت، شمشێرەکەت بە فیکرو مەعریفە تیژتر بێت. ئەوەی پێویستە لەسەر ئەو زمانانەی کە هەڕەشەی لە ناوچوونیان لێدەکرێت. ئەوەی پێویستە لەسەر ئەو کەلتورانەی که خەریکە بە پەراوێز دەکرێن دەست بە جەنگی جۆراوجۆرکردنی زمان و کەلتورەکان بکەن، خۆیان بە فیکرو سۆزو بابەت دەوڵەمەند بکەن پەیڕەو پرنسیپی ئاڵوگۆڕی بکەن .

تۆ رەنگە لە ڕێی ئایینەوە نەتوانی زۆرانبازییەکان تاسەر بەریت. دەشێ توانای ئایینی ئابڵۆقە بدرێت، بەڵام زمان نا. تۆ ناتوانی لەیەک کاتدا مەسیحی بیو موسوڵمان بیت، بەڵام دەشێ بە عەرەبیو فارسیو تورکی قسە بکەیت. زمان خاوەنی ئەو تایبەتمەندییە سەرسامکەرەیە کە هەم رەگەزی ناسنامەیەو هەم ئامرازی پەیوەندی، هیچ ناسنامەیەک بێزمان نییە. دەشێ بەهۆی زمانەوە بەشداری لە رەگەزێکی ناسنامەی ئەویدیکە بکەیت. هەمەجۆری لە زماندا تەوەرەی هەموو هەمەجۆرییەکانی دیکەیە. پێویستە هەموو تواناکانی خۆمان بۆ هەمەجۆرکردنی زمان خەرجبکەین، زمان دنیایەک پێداویستیمان بۆ پڕدەکاتەوە تەنها پێویستی ناسنامە نەبێت.

کەواتە دەرگاکان لەسەر پشتن با هیچ کەسێ خۆی بەدوور نەگرێ، ئەو ژیارەی کە دەسازێ هاوبەشە هەموو کەسێ دەتوانێ بەشێک لە کرۆکی زمان و ناسنامەی خۆی تیابدۆزێتەوە، بەشێک لە رەمزە کەلتورییەکانی خۆی تیا ببینێ، دەتوانێ بە پێی تواناکانی خۆی تەماهی بکات ئەگەرچی وەک پێویست نەبێ، پێویستە لەو رەوتە دانەبڕێن.

# دەرئەنجام

١- لە سەرەتا گوتمان (ئاسنامە کوشندەکان. یان بکوژەکان) شێوازێکی دیکەیە بۆ تەعبیرکردن لە خۆ. بەو مانایەش دەتوانین بڵێین هەوڵێکە بۆ نوسینەوەی جۆرێکی دیکە لە یادەوەری. ئەو بۆچوونەش بە هیچ شێوەیەک لە ئاستی فیکریو رۆشنبیریی ئەو کتێبە کەمناکاتەوە. بەڵکو ئاماژەکردنی خەونە لەبنەهاتووەکانی (ئەمین مەعلوف)ە. ئاماژەکردنی فرەرۆشنبیریی ئەو نووسەرەیە. دواجار ئاماژەکردنی فرەشێوازییە لە نووسیندا.

٢- دەشێ گەڕانەوە بۆ ئەساڵەت و بەرزکردنەوەی رەگەزە زیندووەکانی کەلەپور لە رێگەی رەخنەو خوێندنەوەی فرە رەهەندەوە. راستەوخۆ بە تێزەکەی (جابری)یەوەو لە وێشەوە بۆ بیرکردنەوەی مۆدێرنانە رامانبکێشێ. بەڵام لە بەکارهێنانی ئەو زاراوانەی کە مۆدێرنەیان بڕیووە دەبێ وریاتر بین. (ئەمین مەعلوف) لە درێژەی نووسینی ئەو کتێبە بۆ ئەوەی فریای ئەو وریاییە بکەوێت هەوڵدەدا رەگەکان هەڵکەنێ تا پێویستییەکانی ئاسنامە لە رووە تەقلیدییەکەی دابماڵێ. هەر لەم رێگەیەشەوە دەکەوێتە دەرەوەی پابەندبوون. وێنەی کۆچ وەک دەریچەیەک بۆ فرەرەنگی و جیاوازییەکان دەکێشێ. وەک وەسیلەیەک بۆ هاوژیانی و هاوگونجان و ئاڵوگۆڕی بە شێوەی زمانی چەمک بەرزی دەکاتەوە پێمان دەڵێ: ئینتیمای دوانەیی و سیانی فریای کردنەوەی ئاسنامە دەکەوێ. کردنەوەی ئاسنامەو قبوڵکردنی جیاوازییەکانیش فریای بەجیهانیبوونمان دەخات.

٣- هەوڵدەدات لێکچوونی لە نێوان ئاسنامە کوشندەکان و فرەرەنگی و بەجیهانیبوون بدۆزێتەوە. لە گەڕانەوەی بۆ ئەو خەونە دەیەوێت بەشداری لە بەجیهانیبوون بکات. بەڵام ئاخۆ رەوتی خێرای تازەگەریی و پێشکەوتن دەرفەتی ئاوڕدانەوەمان دەدات؟ دواجار لە نێوان سەپاندنی سیستەمی ئابووریو سیاسی و کۆمەڵایەتی ئەمەریکا بەسەر دنیاو بەجیهانیبوون دووچاری نیگەرانیو دڵەڕاوکێ نابین. ئایا دڵەڕاوکێ لەم حاڵەتەدا لە هێزدا نییە. دەشێ بە شێوەیەک لە شێوەکان بە ئایینی بچوێنین؟ دواجار لێبوردنی سەدەکانی ناوەڕاستو جاڕدانی مافی مرۆڤ لێکجیایە.

٤- دوای هەندی گومان لەکۆی بۆچوونەکانیدا بەرگری لە بەجیهانیبوون دەکاو گەشبینی خۆی دەردەبڕێت. بەڵام دوومەرجی بنەڕەتی کە جێگای قسەکردنن دەخاتە روو ئەوانیش ئیرادەی تاکو ئیرادەی سیاسیە لەسەر ئاستی دەوڵەت. پاشان کۆی پەیوەندییە ناسروشتییە ناوەکیو دەرەکییەکان دەخاتە روو. نەک بە مانای هێرشکردنەسەر. بەڵکو بەو مانایەی کە بیسەلمێنی کە بێکەڵکن.

## سەرچاوەو پەراوێزەکان:

١- مسالة الهوية /الدكتور محمد عابد الجابري/ مركز الدراسات الوحده العربيه ١٩٩٥.

٢- گۆڤاری (الفكر العربي المعاصر) ژ ٧/٦ ساڵی ١٩٨٠ د.جۆرج زيناتی.

٣- الهويات القاتلة- قراوات في الانتماء والعولمة/ امين معلوف. ترجمة/ د.نبيل محسن/ ١٩٩٩-سوريا.

(ئەمین مەعلوف) نووسەرو رۆشنبیری هاوچەرخی عەرەبی. لە نووسینی رۆماندا ئەزموونێکی تایبەت بەخۆی بونیادناوەو لە میانی ئەو ئەزموونەشدا مێژوو وەک پێکهاتەیەکی سەرەکیو وەک بنەمایەک بۆ تێرامان لە ئێستا دەخاتە روو. هەر لەوێشەوە سەفەر بە ناو شوێن و کاتدا دەکاتو دەیەوێت لەو سەفەرانەوە زیارییەکان بدۆزێتەوە. لەوێشەوە بەرەو ناخی مرۆڤ شۆڕبێتەوە .

کتێبی ((ناسنامە کوشندەکان -بکوژەکان-)) شێوازێکە دوور لە شێوازی رۆمان نووسین. بەڵام وەک چۆن لە رۆماندا بەرەو ناخی شتەکان شۆڕدەبێتەوە لەم کتێبەشدا قسە لە ئاڵۆزیو ململانێ ئەنتیکەییەکان دەکاتو رەگەزە زاڵ ورەگەزە چەپێنراوەکانی ناسنامە دەخاتە بەر باسو لێکۆڵینەوە. بەزمانی چەمکو گۆڕانکارییە چەمکیەکانەوە قسە لە لێبوردن و ئازادی و ماف دەکات. هەربەو مانایەش هەوڵی لێکنزیکبوونەوەی رۆشنبیری ئەمڕۆو دوێنێ دەدات. باس لە پێکهاتەیەکی رۆشنبیری فرە رەهەندو جۆراوجۆر دەکات.

(ئەمین مەعلوف) دەڵێ: نووسین نیشتمانی منە. بەڵام ئەگەر زمان بە نیشتمان دابنێین دەڵێم من بە سێ نیشتمانەوە پەیوەستم. یەکەمیان زمانی دایکمە زمانی عەرەبی. دووەمیان زمانی تەعبیرکردنمە زمانی فەرەنسی. پاشان بە پلەی سێیەم پەیوەست بوونێکی هاوڕێیانەو تایبەتیم بەهۆی خێزان و مێژووەوە بە زمانی ئینگلیزییەوە هەیە. وەک لە کتێبی ((ناسنامە کوشندەکان))یش دەردەکەوێت بەردەوام پارێزکاری لەو فرەییەی زمان دەکات و بەسەرچاوەیەکی دەوڵەمەندی رۆشنبیری دەیداتە قەڵەم .

ئەمین مەعلوف خاوەنی رۆمانی (لیون ئەفریقی)یەکە بۆ حەفدە زمانی زیندووی دنیا تەرجەمەکراوە. کاتێ کە ساڵی ١٩٨٦ لە پاریس دەرچوو (٣٠٠) هەزار دانەی لە فەرەنسا لێفرۆشرا. جگە لەو چاپکراوانەی کە بە شێوەی کتێبی گیرفان بڵاوکرانەوە. ئەو رۆمانە لە (٤٠) وڵاتدا دابەشکراوە. ئەو پیاوە خاوەنی رۆشنبیرییەکی فرەیە. بۆیە بە یەکێک لە رۆشنبیرە یونیڤێرسالییەکان ناوی دەرکردووە. ئێمە لێرەدا هەوڵماندداوە کۆمەڵێک لایەن لە کتێبی (ناسنامە کوشندەکان) بخەینە روو. پاشان هەندێ پرسیار بۆ بەدواداچوون و راڤەکردن بەرزبکەینەوە (((بۆ ئەو زانیارییانە بڕوانە گۆڤاری (الوسط)) ژ ٤٤٦- ٢٠٠٠/٨/١٤))

٤- قضايا في الفكر المعاصر- دكتور محمد عابد الجابري/ ک ١٩٩٧ ل٢٥-٢٨

٥- الاسطورة والمعنى – كلود ليفي ستراوس / ترجمة وتقديم: د.شاكر عبد الحميد/ مراجعة: د.عزيز حمزه- بغداد ١٩٨٦.

# بەجیهانیبوون
# فۆڕمێکی دیکەی بیرکردنەوە

(1)

بەجیهانیبوون ڕستێک پرۆسەی یەکانگیرو تێکچڕژاوە، خۆی لە دووتوێی بڕاقی بیرو سەرمایەو زانیارییەکان بەرجەستە دەکاتو هەر لەوێشەوە دەلالەت لە ئابووری ئەلکترۆنی و ڕاگەیاندن و بوارەکانی تەلەفزیۆن و ئەو واقیعە دەکات کە لە دەرئەنجامەکانی شۆڕشی زانیارییەکانەوە سەرچاوە دەگرێت. ئەو شۆڕشە کە بڕوامان بە (شوێن) لەق دەکات و زەمەن بۆ یەک دەهێنێتەوە. یان بە مانایەکی دیکە زەمەن چڕدەکاتەوە بۆ ئەوەی زەمەنێکی فیعلی بەرهەمبهێنێ هەرلەوێشەوە ماناکانی شوێن دەوەرێ و شۆڕشی ژمارەکان دێتە مەیدانەوە، شۆڕشێ کە هەموو واتاکانی لە دونیایێکی بچوک کۆدەکاتەوەو تەنها کۆدێک، یان لێکدانی دوگمەیەک ڕۆشنی دەکاتەوە. واتە لە لێدانی دووگمەیەکەوە بەرەو دنیایەک زانیاریو دنیایەک تۆڕی ئاڵۆزو جۆراوجۆرمان دەبات. دنیایەک کە لە واقیع ناچێت و واقیعیشە، دەشێ ئەو دنیایە لە گۆڕینی بەرهەمە میکانیکییەکانەوە بۆ ئەلکترۆنی، لە مادەی زبرو قورسەوە بۆ شەفاف و نەرم، لە بەڕێوەبردنی شتەکانەوە بۆ بەڕێوەبەردنی زانیارییەکان، لە کاری دەستییەوە بۆ "کرێکاری مەعریفی "یان کاری مەعریفی، ئەو کردە کۆمەڵایەتییە نوێیە بەپێی بەرنامەی زانیارییە ئەلکترۆنییەکان کاردەکات و بەرهەم دەخاتەوە" ڕێنوێنیمان بکات(١).

هەموو ئەو بەرهەمانەش لە پێناوی خودی مرۆڤو بەرزکردنەوەی ئاستی ژیانو جوڵە خستنە نێو فیکرو بیرکردنەوەو حەزە کەبتکراوەکانی مرۆڤ دەخاتە روو. نەک بەو مانایەی چینێک سەروەری چینێکی دیکە بکات. نەک بەو مانایە کە کۆمەڵێک پێشڕەوایەتی کۆمەڵێکی دیکە بکات. بەڵکو بەو مانایەی کە تەواوی رەنگە جیاوازەکان لە رێگەی ویستی هێزو ئیرادەو چالاکییە مەعریفیو فیکرییەکان خۆی بنوێنێ. بەو مانایەی کە بزاڤ و کرانەوەو ناکۆکی و هاوگونجانەکانی مرۆڤ وەک ئیرادەو ئیبداع. وەک ویستی هێزو گۆڕان و جێگیرنەبوون تەعبیر لە رۆحی سەردەم و ویژدانی زیندووی مرۆڤانە دەکات. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بەجیهانیبوون هەر تەنها ئەوە نییە کە چۆن خۆمان بگونجێنین. خۆی ئەوە گرفتەکەیە. چونکە لەپاڵ ئەوەشدا گرنگ ئەوەیە رەگەزە زیندوو مردووەکانمان لەیەکجیابکەینەوە. واتە چۆن دەتوانین لە رێگەی رەگەزە زیندووەکان مامەڵە لەگەڵ رۆحی سەردەم بکەین؟ پاشان لەوێشەوە چۆن بتوانین سەرمایەو هێزو مەعریفە بەیەکەوە گرێ بدەینو دەقێکی سەروتری "Hyper"(2) لێ دابهێنین. دەقێک کە لە رێگەی هەر سێ سیستەمی نوسین و بینین و بیستن خۆی کۆدەکاتەوە.

لێرەدا دیاردەی بە جیهانیبوون سەرەڕای ئیشکالییەتەکانی. دیاردەی داهێنان و پرۆسیسەکردنی فیکرو مەعریفەو سەرمایە لەخۆ دەگرێت. کەواتە داهێنان –چەمکی مرۆڤی سەردەمە. چەمکێکە مرۆڤ وەک سێنتەری گەردوون و سەروەری سروشت دەخاتە روو. هەر بەومانایەش رێگا خۆشکەرە بۆ پرۆسیسەکردنی وزە کەبتکراوەکان. رێگا خۆشکەرە بۆ بەشداری کردنی جیدیانەی ژیان. رێگا خۆشکەرە بۆ پراکتیزەکردنی خەون و هیوا دواخراوەکانی خودو سەدەکانی پێشووی مرۆڤایەتی. هەر لەوێشەوە دەشێ هەڵوێستی مرۆڤ. هەڵوێستی هێزو چالاکی و کردەو بزاڤەکانی ناوەوەی مرۆڤ بێ. نەک بەمانا تەقلیدییەکەی. بەڵکو بەو مانایەی کە مرۆڤ هەمیشە قابیلی بەرەوپێشچوون و گۆڕانە. بەو مانایەی کە مرۆڤ خۆی کردەیەکی ئیبداعییەو هەمیشە دەکەوێتە دەرەوەی زەمەن و دەرەوەی شوێنەوە. دەکەوێتە سەرووری پێوانەکان و فۆرمەکانیانەوە.

(2)

کەواتە مرۆڤی سەردەم، مرۆڤێکە داهێنان لە ناخیدا زیندووەو دەیەوێ رۆشنایی ببینێ. بەو مانایەش هەر خوێنێک ئەتوانێ تەجاوزی سنوورەکانی حەرامو حەڵاڵ بکات. ئەتوانێ بجوڵێتەوەو ئیبداع لە ناخیدا خەوتووبێ. ناتوانێ بەشداری لە پێشکەوتنەکانی دنیا بکات. ئەگەر بەشێک لە بەجیهانیبوون دەلالەت لە هێزی ناوەوەی مرۆڤ و واقیعی سەرروتر بکات. کۆمەڵێک خەیاڵی داهێنەرانە بێت. ئەگەر بەشێک لە بەجیهانیبوون گەڕان بێ بەدوای مرۆڤ و ئازادییەکانی ناخی مرۆڤ و هاوپەیوەست بوون. ئەگەر بەشێک لە بەجیهانیبوون هێنانەدی واقیعێک بێ کە تیایدا بەهاو فۆرم و پێوانە باوەکان بەرەو گۆڕان بەرز بکاتەوە. ئەگەر بەشێک لە بەجیهانیبوون حەزە دواخراوەکانی مرۆڤی لەخۆ گرتبێ و دەلالەت لە کرانەوەو بەرفراوانبوون و فرەیی و جیاوازییەکان بکات. بە دیوەکەی دی فۆرمێکی دیکە بە دنیای دەستەبژێرو رۆشنبیرو فەلسەفە.. دەبەخشێ. بۆیە دەبێ وەک هەر فۆرمو پێوانەیەکی دیکە بیر لە رۆشنبیر بکەینەوە. دەبێ بەشێوەیەکی دیکە بیر لە بەساڵاچوونی بەهاکانی رۆشنبیرو ئەو وەهمە دروستکراوە بکەینەوە کە رۆشنبیر بە دەوریدا دەسوڕێتەوە. ئیتر رۆڵی پیرۆزی رۆشنبیران پێویستی بە چاوپێخشانەوەو لێوردبوونەوەو خوێندنەوەی جیاواز هەیە. ئیتر زەمەنی "زولا"و "سارتەر" بەسەرچوو. ئیتر پێگەکانی رۆشنبیر گومان دەبیات. هەرگیز ناشێ بەهەمان شێوەی پێشوو بیریان لێبکەینەوە. دەبێ بۆ ماناو پێوانەیەک بگەڕێین کە قابیلی سەردەمی ئینتەرنێت و فەزای سبریانی(٢)و شۆڕشی تەکنۆلۆژی و ژمارەکانە. مانایەک کە هاوشانی مرۆڤی سەردەمە. لێرەوە رۆشنبیر پیاوێک نییە لەسەر شانۆ قسەمان بۆ بکات و هەڵوێست بنوێنێ. پیاوێک نییە چەپڵەی بۆ لێبدرێ و ستایش بکرێ. پیاوێک نییە کەلە سەرووی ئاستی هۆشیاری لەسەرووی مەعریفەو هەستی کۆمەڵگاوە بێ. یان وەک پیاوێکی هاوپەیوەست کۆمەڵێک چەمک بەرزبکاتەوەو کۆمەڵێکی دی بشارێتەوە. پیاوێک نییە دەستمان بگرێ و هەڵمانخزێنێ و خیانەت لە بیروڕاکانمان بکات و لافیش بە خیانەت و ورەی هەڵخزێنی ناوەوەی خۆی بکات. ئیتر پیاوێکە رووت. پیاوێکە ئەمڕۆ ناتوانێ کەس هەڵخەڵەتێنێ. پیاوێکە دەشێ لە باشترین حاڵەتدا فۆرمێک بێ لەو فۆرمانەی کە بە هۆی فیکرو کردەی داهێنەرانەی خۆیەوە ورە کەبتکراوەکانی ناوەوەی

مرۆڤ بەرزبکاتەوە. پیاوێکە لە باشترین حاڵەتدا دەشێ بەشداری لە وەجوڵەخستنی هێزەکانی ناوەوەی مرۆڤ بکات. نەک پردێک بێت بۆ گەیشتن بە بەرژەوەندییە تایبەتییەکانی خۆیو لەوێشەوە بەرەو سێبەری دەسەڵاتمان بەرێت. هێزەکانی ناوەوەمان بکوژێنێتەوە. بەو مانایەش دەشێ هەڵخەڵەتاوەکان ئەو هێزە کوژراوانە بن کە پەیوەندی هۆشیارانەیان بە واقیعەوە پچڕاوە. یان ئەو دەبەنگانە بن کە بەیەکچاو سەیری ژیان دەکەن. ژیان بەیەک ڕەنگ دەبینن. ئەوانە لەپێش شۆڕشی زانیارییەکاندا دەژین. ئەوانە بەردەوام ژیان وەدوادەخەن. ژیان لەیەک ڕستەدا دەبینن. ڕستەیەکی بێکرێە. ڕستەیەک کە هەمیشە لە چاوەڕوانی تابووتدایە. ڕستەیەک کە هەمیشە بەرەو کوژانەوەمان دەبات. ڕستەیەکی دەستەپاچە. ڕستەیەک کە هەمیشە بەرەو ملکەچی دەچێ.

بەومانایە ئەمڕۆ ڕۆشنبیر پیاوێک نییە ڕۆژانە لە پێناو بەرژەوەندییەکانی دەمامکەکان بگۆڕێ. مرۆڤی ئەمڕۆ ژیان بەهەموو ڕەنگەکانییەوە دەبینێ. پێویستی بە یەکێک نییە ڕەنگەکانی بۆ شیبکاتەوە. مرۆڤی ئەمڕۆ هەموو ئاستە جیاوازەکانی ژیان دەناسێ. ئەمڕۆ ژیان دەکەوێتە دووتوێی پەیوەندییە ڕووتەکانی سەرشاشە. ئەو پەیوەندییانەی کە مەسافەیەکی یەکجار دوور بە چرکە دەبڕێ. ئیتر ڕۆشنبیر پیاوێک نییە لەتوێی دەمامکەکان بیربکاتەوەو دەست لە کاروباری ژیانی مرۆڤی سەردەم وەربدات. بەڵکو دەشێ وەک هەر مرۆڤێکی داهێنەر لە دووتوێی پەیوەندییە فیکرییە جۆربەجۆرەکان دەرکەوێت. ئەمڕۆ ڕۆشنبیر ئەو یاریزانەیە کە لە چرکەساتە حەساسەکاندا دەتوانێ ڕەهەندەکانی فیکری خۆی بەنەخشێنێ و لە دەقی سەروترەوە دنیایەک بخوڵقێنێ کە لە ناواقیع نزیکترە. نەک لە واقیع. چونکە مرۆڤ لە ڕێگەی شۆڕشی زانیارییەکانەوە. لە ڕێگەی شاشەکانەوە ئەو بوونەوەرە حەساسەیە کە فێڵی لێناکرێت. بوونەوەرێکە پێویستی بە درێژدادڕی ڕۆشنبیری نییە. دەتوانێ بەیەک نیگا لە لێدانی دووگمەیەک ئەودیو شتەکان کەشف بکات. بە لێدانی دوگمەیەک یەک دنیا زانیاریمان پێدەبەخشێ. بەیەک نیگا وێنەی دنیامان دووبارە بۆ بنەخشێنێ.

گوتمان ڕۆشنبیر ئەمڕۆ پیاوێکە دەشێ بەهۆی وزە فیکرییەکانی دەوری یاریزانێ. یاریزانێکی بە سەلیقەو شارەزاو داهێنەر تۆمار بکات. یاریزانێک کە ئامادەیی چالاکانەو

داهێنەرانەی لە گۆڕەپانی یاریدا هەیەو دەتوانێ ئاستی یاری بۆ سەرووی چێژی جەماوەرو سەرووی واقیع بەرزبکاتەوە، دەتوانێ بەرگری لە ئیستاتیکای داهێنان بکات.

واتە ئەوەی دەشێ ئەقلی فیکر لە سەر شانۆ نیشانی مرۆڤی بدات، بەرزکردنەوەی ئاستی چەمکەکان و رازاندنەوەی ئەو چەمکە یەک بەدوایەکانەیە کە رۆژانە دێنە بەرهەم. ئەو چەمکە فیکری و مەعریفیانەی کە بەپێی داهێنانە لەبنەهاتووەکانی مرۆڤ لە گۆڕەپاندایە. یان بەمانایەکی دیکە دەشێ رۆشنبیر لەسەر بنەمای گۆڕانکارییە بەردەوامەکان قسەی خۆی دابمەزرێنێ. هەر لە دووتوێی ئەو دامەزراندنەش زەمەنێکی فیعلی(٤) بخاتەوە. هەر لەسەر ئەو بنەمایەشەوە چاو بە قسەکانی خۆیدا بخشێنێتەوەو رەهەندەکانیان بەرفراوانتر نیشان بدات، لە رێگەی دەقە ئیبداعییەکانەوە مانایەکی دیکە بە ژیان دەبەخشێ.

لێوردبوونەوەی رۆشنبیر. لێوردبوونەوەیە لەگەڵ ئەو فەزایەی کە لە چرکەیەک لە چرکەکان دنیا لە خاڵێکی بچوکو فرەرەهەند دووردەوبا دەتەقێنێتەوە. بێگومان ئەمڕۆ لێوردبوونەوە لەسەر بنەمایەکی جێگیرو مانایەکی پتەو ناوەستێ. بەڵکو رێک لەسەر کۆمەڵێک مانای جیاوازو بنەمای جیاواز کاردەکات، یان بە واتایەکی دیکە بۆ مانا ناگەڕێتەوە. بەڵکو بۆ هاوشێوەبوونی ماناکان دەگەڕێتەوە. رەنگەکان تۆخ دەکاتەوەو تاک مانایی تێکدەشکێنێ. هەر لە تێکشکاندنی ماناکانەوە ئەسڵێک دەسازێ کە لە لقەکان پێکهاتووە. ئەسڵێک کە هەجینە. ئەسڵێک کە لەسەر بێمانایی خۆی دروستکردووە. بێمانایییەک کە بەهاور هەڵوێست و پێوانەو جیهانبینی و چەمک و فۆرمی خۆی لەساتەوەختی ئازادییەوە بونیادناوە. فرەیی ئەو بێمانایییەش پڕە لە دەلالەت و مانای تۆرنامێزو رەنگاورەنگ. دنیایەکی جیاوازو جیاکارە. دنیایەکە لە دووتوێی دابڕان و گەیشتنەوە خۆی نوێ دەکاتەوە.

(3)

دواجار دەبێ بڕوامان وابێ کە دنیا بەبێ فیکرو کردە ئیبداعییەکان ناتوانێ خۆی لە جیاوازی و ناکۆکی و هاوگونجان و گۆڕان نزیک بکاتەوە. ناتوانێ رەنگەکان بۆخۆی دابڕێژێ و گۆڕان پراکتیزە بکات. بەومانایەی کە گۆڕان رێکخستنی پەیوەندی رەگەزەکانی هێزەو پشت بە وزەکانی ناخی مرۆڤی داهێنەرەوە دەبەستێ. هەرگیز فیکرو داهێنانیش بێ

ئازادی بوونی نییه. ئازادیش پابەندی ئیرادەی خودو وزە لەبنەهاتووەکانی ئاخی مرۆڤی ئاهێنەرە. بەڵام ئاهێنان و وزە خەفەکراوەکانی ئاخی مرۆڤ هەرتەنها پابەندی شوێن و زەمەنێکی دیاریکراو نییە. ئەمڕۆ پەیوەندییەکانی شوێن کات. پەیوەندییەک نییە لە دووتوێی سنوورو زەمەنی دیاریکراو دێتە بەرهەم. بەڵکو پەیوەندییەکە راستەوخۆ لە فیکرو ئاهێنانەوە هەڵدەقوڵێ و لە رێگەی بوارەکانی راگەیاندنەوە دەکەوێتەوە سەر شاشە. ئەمڕۆ راگەیاندن تەواوی ماوەکان و سنورەکان لەیەکدا دەتوێنێتەوەو ژیان لە چەمک و دەلالەتی نوێدا بونیاد دەنێتەوە. ئەمڕۆ ئازادی و بیرکردنەوەی ئازادیش لەوەدایە کە بتوانی لە دووتوێی رەگەزە تەباو ناکۆکەکانەوە. هاوگونجانێ لەگەڵ بەرامبەر بسازێنی. هاوگونجانێ کە رەنگەکان فەرامۆش نەکات. واتە خودی ئازادی پابەندی خودی جیاوازییەکانیشە. وەک ئەوەی ئەویدیکەی جیاواز بەشێک بێ لە پێکهاتەی خودی تۆ. وەک ئەوەی خود بەردەوام وەک پێکهاتەیەکی ئاوێتەو کراوە. ئیمکانی شیمانەیی خۆی لەدەست نەدات. بەمجۆرە نابێ هەرگیز لەبیری ئەوەدابین کە لە رێگای بیرکردنەوە لەگەڵ واقیع یەک یەکبگرینەوە. هەروەک چۆن نابێ بۆ واقیعێک بگەڕێین کە لەگەڵ بیرکردنەوەکانمان تەبا بێتەوە. بەڵکو ئەبێ بەردەوام بیر لە گۆڕینی ئەو شتانە بکەینەوە کە لەسەری وەستاوین. بۆ ئەوەی لە دەرەوەی فەزاو جوگرافیای بەرهەمهێنانەوە مامەڵەیەکی دیکەی سەردەمخوازانە بەجێبهێنین. بەومانایەش ئاهێنانی بوونی مرۆڤایەتی راستەوخۆ بە رووداوە یەک لە دوایەکەکانی دنیاوە پەیوەستەو لەوێشەوە پشت بە ئاهێنانی تەکنیکی و فیکری و پێشکەوتنەکانی زیارییەوە دەبەستێ. هەموو ئەوانەش دەلالەت لە گۆڕانکارییە مێژووییەکان دەکەن.

کەواتە دواجار ئەوەی کە جێگای قسەکردنە. گۆڕانی بەردەوامە. ئەوەی کە جێگای قسەکردنە جێگیرنەبوونە. جێگیرنەبوونی میکانیزمەکانی فیکرو مەعریفە. جێگیرنەبوونی ژیان و ئاستە جیاوازەکانی ژیان. بەومانایەش کاتێ قسە لە گۆڕینی چوارچێوەکان دەکەین خودی ئاسنامەش دەخەینە بەردەم خوێندنەوەی جۆراوجۆرەوە. خوێندنەوەی جۆراوجۆری ئاسنامەش دەلالەت لە رەگەزە جیاوازەکانی خودی ئاسنامە دەکات. هەر لە رێگای ئەو رەنگانەشەوە پەیوەندیی لەگەڵ ژیان نوێدەکەینەوە. چونکە وەک "ئەمین مەعلوف" دەڵێت(٥): "هیچ رەگەزێ لە رەگەزەکانی ئاسنامە ناتوانێ بە تەنیا وەڵامی پێداویستییەکانی سەردەم بداتەوە. هیچ پەرچەکردارێک (ئایینی. ئاسیونالی. سوسیالی..) لەوەدا ئەماوە بتوانێ

بۆ ساتە مێژووییەکانی خۆی بگەڕێتەوە، سەروەرییەکانی خۆی دووبارە بەرجەستە بکاتەوە. ئەوەی لەمڕۆش دەترسێ لە گۆڕانکاری دەترسێ ئەوەی لە گۆڕانکاری و ڕەگەزە جیاوازو فرەڕەنگەکانیش دەترسێ بێگومان لە داهێنانیش دەترسێت. ئەوەی لە داهێنانیش دەترسێ هەرگیز ناتوانێ پەیوەندییەکی دیکەی ڕەخنەگرانە لەگەڵ خودو واقیع دابمەزرێنێتەوە.

کاتێک مرۆڤ لەم ئاستەدا بیر لە ئاسنامە دەکاتەوە، یان بە مانایەکی دیکە کاتێ مرۆڤ بەرەو بەجیهانیبوون دەچێ، لەگەڵ خۆشیدا ئاسنامە بەرەو ئەفسانە دەبا. بە ئەفسانەکردنی ئاسنامە، دەشێ لە پەیوەندییە خێراو چرکەساتخوازەکانی خودی بەجیهانیبوون هەڵبگرینەوە، بەو مانایەی کە دەشێ تەنها بە پەنجە داگرتنێک، هەموو سنوورە دوورەکانی جوگرافیا ببڕێ، وەک بەخێرایی تیشک زەمەن دەبڕێ، بەو مانایەش ئەگەر کەلەپورو ئاسنامەی ڕۆشنبیریی ڕەنگە جیاوازەکانی ژیان بنوێنێ، ئەگەر ڕۆشنبیریی دەلالەت لە زەمەن و یادەوەری بکات، بە جیهانیبوون پەیوەندی بە ژیارەوە هەیە، ئەو شوێنەیە کە ناوی گوندێکی بچوکی لێناوە، خودی ئەم ناوانەش جۆرێکە لە بەئەفسانەکردنی کەلەپورو ئاسنامە، بەو مانایەی کەلەپورو ئاسنامە دەکەوێتە زەمەن و یادەوەرییەوە.

(4)

دواجار قسەکردن لەسەر بەجیهانیبوون، قسەکردنیشە لەسەر کۆی ئەو چەمکانەی کە سەرەوژێر کراون، یان بە مانایەکی دیکە کە گۆڕانێکی یەکلاکەرەوەو بەرفراوانیان بەسەرداهاتووە. کەواتە لێرەدا لە میانی گۆڕانی چەمکەکانەوە دەشێ بیر لە گۆڕینی چەمکی ئازادی و دادپەروەریش بکەینەوە، چونکە مەحاڵە بێگۆڕینی جیهانبینیمان بۆ دنیا بتوانین قسە لە فۆڕمێکی دیکەی ئازادی و چەمکی ئازادی و ڕووەکانی ئازادی بکەینەوە. هەروەک مەحاڵیشە چەمکی حەقیقەت بگۆڕین بێ ئەوەی جۆرێکی دیکە لە پەیوەندیی لەگەڵ ئازادی ڕێکنەخەین. ڕێکخستنەوەی پەیوەندییەکانیش چاوخشانەوەیە بە میکانیزمەکانی فیکرو مەعریفەو کردەکانی داهێنان و جیهانبینییەوە. هەر لەوێشەوە دەتوانین دەست بۆ چەمکی ئازادیو دواجار چەمکی دادپەروەریش بەرین و بیانخەینە ژێر نیشانەی پرسیارەوە. تەواوی ئەو پرسیارانەش لەو هێزەوە سەرچاوە دەگرێ کە خاوەنی دەقی سەروترە. ئەو هێزەی کە

هۆشیاری و دەرککردنمان لە ئاستێکەوە بەرەو ئاستێکی دیکە، ئاستێک کە لەدەرەوەی چاوەڕوانیدایە. لەو هێزەوەیە کە پەیوەندییەکانی زەمەن و شوێن بەرەو چرکەساتی تەقینەوە دەبات. خودی ئەو تەقینەوەیەش لەسەر ئاستی پەیوەندییەکان وەک گوتمان راستەوخۆ زەمەنی فیعلی لێ لەدایک دەبێت. بەو مانایەش شۆڕشی راگەیاندن هەموو دەریچەکانی نێوان مرۆڤو ئامێر کورت دەکاتەوە، بۆ چەند درزێکو بوارێکی دیکە بۆ میکانیزمەکانی فیکرو مەعریفەو داهێنان دەخاتە ڕوو. هەرلەخودی ئەو بوارە رەنگاوڕەنگ و بەرفراوان و کراوەیە پێگەی رۆشنبیرو ئاسنامەو فەلسەفە بە شێوەیەک لە شێوەکان دەکەوێتە لەرزینەوە. یان فۆرمێکی دیکەی جیاواز دەخوازێ تا لەوێوە قسە بکات. فۆرمێک رەنگە لە خەیاڵماندا چوارچێوەیەکمان بۆ ئامادەکردبێت. یان فۆرمێک کە ئەسڵەن بیرمان لێنەکردۆتەوە. هەر لێرەشەوە دەبێ بیر لەو تۆڕە چەمک ئامێزە بکەینەوە کە رۆژانە لە گۆڕانی بەردەوامدا وێنەی خۆی دەکێشێ. واتە ئەوەی نەتوانێ بەردەوام واقیعی خۆی بگۆڕێ، ناتوانێ لە زەمەنی خۆی ئامادەیی هەبێ. کاتێکیش نەیتوانی لەزەمەنی خۆی ئامادەبێ هەرگیز ناتوانی بیر لە پێشهاتەکانی بەیانی بکاتەوە. بە واتایەکی دیکە کاتێ نەتوانێ بەشێوەیەکی کراوەو بەرفراوان بیر لە زەمەنی خۆت بکەیتەوە ئامادەیی خۆت لەو زەمەنەدا بنوێنی، هەرگیز ناشتوانی پارێزگاری لە ئاسنامەو بەرگری لە پێکهاتەکانی خودی خۆت بکەیت.

دواجار مرۆڤی بێجوڵەو بزاڤ و کردەی داهێنەرانە، ناتوانێ بەشداری لە پێکهاتەی گۆڕانکارییەکانی دنیا بکات، ئەو گۆڕانکارییانەی کەلەسەری وەستاوە، جا بۆئەوەی بتوانی بەشداری لەو پێکهاتەیە بکەیت، پێویستە بەشداری لە پێکهاتەی خودی ئەویدیو داهێنانەکانی ئەویدیو میکانیزمەکانی فیکرو مەعریفەی ئەویدی بکەیت، ئەوەی کە لە تۆ نزیکەو ئەوەی کەلە تۆ دوورە، ئەوەی کە تەبا دێتەوەو ئەوەی کە جیاوازە.

# سەرچاوەو پەراوێزەکان،

١- بۆ بەدواداچوون بگەڕێوە بۆ: حديث النهايات- فتوحات العولمة ومرزق اهوية- علي حرب- المركز الثقافي العربي. ج١ ٢٠٠١.

٢- دەقی سەروتر – هـ.س.پ. بەشی زاراوەکان. هـ.س.پ. ل٢٠٠.

٣- فەزای سبریانی- وەسفی ئەو واقیعە، یان دنیایەکە لە ئەنجامی شۆڕشی زانیارییەکانەوە دێتە بەرهەم (سبریانی) واتە زانستی تەحەکومکردن و ڕێکوپێککردن- بڕوانە: هـ.س.پ..

٤- زەمەنی فیعلی: ئەو زەمەنەیە کە بە خێرایی تیشک دەڕوات، بڕوانە ه.س.پ..

الهويات القاتلة- قراوات في الانتماء والعولمة – امين معلوف. ترجمة: د. نبيل محسن. ج١. ١٩٩٩ سوريا.

# چەمکی دڵەڕاوکێ لە تێڕوانینی (فرۆید)

دڵەڕاوکێ لای فرۆید ڕۆڵێکی سەرەکی لە نەخۆشییەکانی دەمارگیرییەکاندا دەگێڕێ. بۆیە بەدواداچوونی ڕەنگە بەگرنگترین بەرچاووخستن و بەرجەستەکردنی نەخۆشییە دەمارگیرییەکان بژمێردرێت. بەڵام بەرلەوەی ڕاستەوخۆ بچینە ناو تیۆرەکانی (فرۆید) بەگشتی هەندێ لایەن لە دڵەڕاوکێ باسدەکەین. تالەوێوە ڕێگای بەدواداچوون خۆشتر بکەین. لەدوایشدا دووبارە بۆ بیروڕایە دژەکانی خودی (فرۆید) دەگەڕێینەوە نەوەک بە مەبەستی ڕەخنەگرتن بەڵکو هەرتەنها بەنیازی بەرفراوانکردنی بابەتەکەو سوود وەرگرتن.

دڵەڕاوکێ حاڵەتێکە دەلالەت لە ترسێکی توندو ناناشکرا دەکات. یاخود بە مانایەکی تر وەک هەموو هەڵچوون و شڵەژاندنەکانی تره لە ئەنجامی ئاگادارکردنەوەیەکی ترسناک

پەیدا دەبێت، دڵەڕاوکێ هەمیشە پەژارەو ئازارو دڵتەنگی دووچاری مرۆڤ دەکات. لە دووتوێی دڵەڕاوکێدا هەمیشە مرۆڤ بەبیتە، وادەستدەکات هەموو ئەو شتانەی کە دەوریان داوە دووچاری زیانی دەکات، یاخود دووچاری ئازاری دەکات، هەمیشە لە خۆی دڵنیانییەو خەمگینە... هەروەها هەندێ دیاردەی جەستەیی هەیە وەک سارداپی چوارپەل و دڵەکوتێ و شێوان و شێوانی هەناسەدان و گەدەو ریخۆڵەو خوێن، هەستکردن بە ماندووبوون و کەمخەوتن و هەندێ ئازاری جەستەیی. (دواتر بۆ هەڵێنانی مانای ئەو دیاردانە خوێنەر پێویستە دوای باسەکە بکەوێت).

لای (فرۆید) دڵەڕواکێ رەتکردنەوەی حاڵەتی ترسە، بە دوو شێوە خۆی دەنوێنێ یەکەمیان دڵەڕاوکێی بابەتی (الموضوعی) کە رەتکردنەوەی ترسی ئاشکرای دەرەوەیە. دووەمیان دڵەڕاوکێی دەمارگیری کە رەتکردنەوەی ترسی ناوەوە، یاخود غەریزەیە. ئەو ترسەش ترسێکی نادیارە فرۆید بۆ ئەو ترسە نادیارە لە شیکردنەوەی (هانزی منداڵ)و (لاوە روسییەکە) بە چڕوپڕی باسی دەکات، جگە لەم دوو حاڵەتەش باسی هەموو حاڵەتەکانی تری ترسی نەخۆشی دەکاتو دەڵێ: خودی ئەو ترسانە لەو ئارەزووە سێکسییەوەیە کە قابیلی قبوڵ نییە. هەروەها ترسی سزادانیش، ترسە لە خەساندن (کوڕ لەتەمەنی منداڵیدا لەوە دەترسێ باوکی بیخەسێنێ) بەو مانایەش ترسی نەخۆشی جێگەی ترسی خەساندن دەگرێتەوە (وەک لای هانز دەبینرێ، یان لای لاوە رووسییەکە... لەمەوە فرۆید دەری دەخات کە ترسی نەخۆشی لە دڵەڕاوکێی دەمارگیریدا، ترسێکی ڕاستەقینەیەو ئەویش ترسی خەساندنە، ئەمەش بە گرێی ئۆدیبەوە پەیوەست دەکات. واتە دڵەڕاوکێی دەمارگیری پەرچە کردارە بەرامبەر ترسی غەریزەکانی ناوەوە، هەر لە دووتوێی ئەو ترسەوەیە کە هەست بە ترسی دەرەوە دەکەین، یاخود بە مانایەکی دی ترسی دەرەوە دەکرێ ئەلتەرناتیڤی ترسی ناوەوە بێ (١) لەمەشەوە بۆمان دەردەکەوێ کە هەر خودی دڵەڕاوکێیە دەبێتە هۆی دووچار بوونی چەپاندن (الكبت). کەواتە دڵەڕاوکێ لە حاڵەتی ترسی نەخۆشیدا، دڵەڕاوکێی ئیگۆیە (الانا) بەرامبەر خەساندن.

لێرەدا بۆ زێتر بەدواداچوونی دڵەڕاوکێ دەکرێ مانای ترس شیبکەینەوە، بەو مانایەش ئەو حاڵەتەی کە فەرد تیایدا هەست بە ترس دەکات، ئەو حاڵەتەیە کە تیایدا هەست بە توندی ئارەزووەکان دەکات لەگەڵ گرێدەوەبوونی وریاکردنەوەی توند لەسەر ئەو

ئارەزووانەو ئەتوانینی تێربوونی ئارەزووەکان بە هۆی تەگەرەی بایۆلۆژی یاخود عەقڵی یان بەهۆی ترس لە سزادان. کەواتە حاڵەتی ترس: لە خەملاندنی هێزی کەسو نیسبەتی ئەو برە ترسەوە هەڵدەقوڵێ کە بەرامبەرێتی. ئەگەر کەسەکە بە هۆی جەستەییەوە دانی پیادانا، ئەوە لێرەدا تەگەرەکە بایۆلۆژی دەکەوێتەوە، بەڵام ئەگەر تەگەرەکە دەروونی بوو ئەوا ترسەکە غەریزەییە. بۆ نموونە: کاتێ منداڵ لە دایکی جیادەمێنێ دەترسێ ..بۆ؟ بێگومان چونکە توانای تێربوونی خۆی نییە، توانای نییە پێداویستییەکان و ئارەزوەکانی خۆی تێر بکات کە لەلایەن دایکەوە مەیسەر دەبێت. بەو مانایەش زیادبوونی ئارەزووکردنی دایک فاکتەرێکی سەرەکی ترسی منداڵە. بەو مایەش ئەگەر ئەو هەڵوێستەی کە منداڵەکە بە ترسی دادەنێو دەیەوێ خۆی لێ بپارێزێ حاڵەتی تێرنەبوون بێتو زۆربوونی دووڵێیەکەشی دەلالەت لەو پێویستیانە بکات، کەواتە ڕەگەزی سەرەکی کە حاڵەتی ترس دەسازێنێ زیندەبوونی بڕی وریاکردنەوەیە (٢)، بێ ئەوەی تاک توانای دەستبەسەراگرتنی هەبێت، لەم حاڵەتەشدا هەردەبێ تاک هەست بە پەککەوتن بکات.

ترسیش بەپێی قۆناغەکانی ژیان دەگۆڕێ و بۆهەر قۆناغێ ماوەیەکی تایبەتی هەیە، جا چ سایکۆلۆژی بێ و ئەتوانێ بەسەر وریاکردنەوەدا زاڵە، یاخود ترس لە دایک دابڕان بێت کاتێک منداڵەکە پێویستی بەو دایکە هەیە، یاخود ترسی خەساندن بێ لە قۆناغی چوکیدا، یا ترس بێت لە سوپەرئیگۆ لە قۆناغی راگرتن ((کف))و دڵەڕاوکێی کۆمەڵایەتیدا.

هەندێ جار ئەو حاڵەتانە لەگەڵ مرۆڤ دەمێنێتەوە بەڕای ((فرۆید)) دەمارگیرییەکان ئەو کەسانەن کە تاکو ئێستا وەڵام دەرەوەی حاڵەتی ترسی کۆن بەڕێوەیان دەبات. هەروەها دەڵێ:

**زۆربەی خەڵک هەر لەسەر هەمان ڕەفتاری منداڵیدا ڕووبەڕووی ترس دەمێننەوەو نەیان توانیووە بەسەر فاکتەرە کۆنەکاندا زاڵبن...**

هەروەها لای ((فرۆید)) سەرچاوەی ترس لە دڵەڕاوکێی دەمارگیریدا لەزیاد وریاکردنەوەو توندی ورووژانەکانی پاڵنەری غەریزە نامەعقوڵەکانەوە دەردەچێ. (فرۆید) بایەخی زۆر بە پاڵنەرە سێکسییەکان دەدات و بە گرنگترین فاکتەری ترس دەیانژمێرێ کە هەڕەشە لە ئیگۆ دەکەن. دڵەڕوکێش کاتێ بە دیار دەکەوێت کە ئەو کەسە بەراستی دووچاری ترسێ بێ. بۆنموونە ئەگەر منداڵێک لە شوێنێ بترسێ لە ئایندەش لەو شوێنە

ئەترسێ یاخود ترس نایئەگرێ. کەواتە ترس وەک ئیشارەتێکە یاخود ووریاکردنەوەیەکە تا ئیگۆ ناماندەباشی خۆی رووبەرووی بنوێنێ. بەو مانایە کارفرمانی (وەزیفە) ترس ناماندەباشی ئیگۆیە رووبەرووی ترسی راگەیەنراو.

هەروەها (فرۆید) بڕوای وایە کە دڵەڕاوکێ ئیشارەتە بۆ ترسی پێشوو ((پێشوو لێرە دوولایەنی ئەگرێتەوە لە بەدواداچوونی ئەو وتارە زێتر روون ئەبێتەوە)) ئەوەش شتێکی باشە بۆ پارێزگاریکردن لە ژیان، دەلالەت لە پێشکەوتنی گشتی توانای تاک ئەکات بۆ پارێزگاری لە خۆی... بەومانایەش دڵەڕاوکێ پەرچەکرداری ترسی حەقیقی بوو، لەمەودوا بووە ئیشارەپێکردنی ترسی راگەیەنراو. هەستکردن بەو ترسەش هەستکردنی دووبارەیە بەترسی ئەسڵی پێشوو.

(1)

بێگومان راگرتن (الکف)و دیاردەکان (العرض) یەک شت نین. ئەکرێ راگرتن دیاردەش بێت بۆ حاڵەتی نەخۆشی، بەڵام راگرتن بە تایبەتی بە وەزیفەوە -کارفرما- پەیوەستەو دەلالەت لە حاڵەتی نەخۆشی ناکات، ئەکرێت دەربارەی راگرتن بدوێین کاتێ کە بێهێزییەکی سادە لە وەزیفەکان ئەبینرێت، بەڵام دیاردە ئەکرێ لەو گۆڕانە نادروستەوە بێت کە لە یەکێک لە وەزیفەکان روودەدات.

یاخود بە جۆرێکی دیکە راگرتن راستەوخۆ بە ئەندامەکانو شێوانی وەزیفەکانی ئەو ئەندامانەوە پەیوەستە. بەتایبەتی ئەوەش لەلای نەخۆشییە دەمارگیریەکان ئەبینرێت. ئەگەر هەر لەمەشەوە دوای وەزیفەکانی خود بکەوین. یاخود دوای نەخۆشییە دەمارگیرییە جۆراوجۆرەکان بکەوین ئەکرێ بۆ لێکۆڵینەوەی بەراوردکاری ئەوانە هەڵبژێرین:- کارفرمانی سێکسی و کارفرمانی خۆراک و جوڵەو پیشە ...

کارفرمانی سێکسی زۆر دووچاری شێوان ئەبێت لە هەموو بارەکانیشدا تایبەتمەندێتی سادەی راگرتن ئەبینرێ، هەندێ لەو شوێنانەش ئەکرێ بەبێهێزی سێکسییەوە پەیوەست بێت...

خودی کرداری سێکس چەند کردەیەک لە خۆدەگرێت کە کردەی ئاڵۆزن هەریەک لەو کردارانەش دەکرێ بابەت بن بۆ شێواندن. ئەو بابەتە سەرەکیانەی کە راگرتن تیایدا روودەدات لای پیاوان ئەمانەی خوارەوەن هەڵگەڕانەوەی (ارتداد) سێکسی (لیبدۆ)و سازنەبوونی جەستە (رەپنەبوون)، کورتبوونی کرداری سێکسی (زوو فڕێدانی تۆو) دەکرێ ئەوبارە بە دیاردەی ئیجابی بژمێردرێ. دواکەوتنی کرداری سێکس بەرلە کۆتایهێنانی سروشتی (فڕێندانی تۆو)، سازنەبوونی دەرئەنجامە دەروونییەکە (هەستنەکردن بە چێژی سێکسی) هەروەها لەگەڵ هەندی کارفرمانی ناسروشتی وەک لادانی سێکس یاخود فیتشە (ئەمەش جۆرێکە لە لادانی سێکسی دەلالەت لەو تەلیسمە یاخود ئەو هێزە سیحرییە دەکات کە لە لەشی خۆشەویستەوە هەڵدەقوڵێ وەک قاچ و پێ یاخود پرچ یان ئەو شتەی بە خۆشەویستییەوە پەیوەستە وەک جلوبەرگو دەسماڵ...).

- **کارفرمانی خۆراک**، لەو شێوانە بڵاوانەی کە دووچاری کارفرمانی خۆراک دەبێت وەک حەزنەچوونە خواردن ئەوەش بۆ هەڵگەڕانەوەی لیبدۆ دەگەڕێتەوە. یان زۆر خواردن. نارەزوویەکی قەهری یان دووبارەبوونەوە بۆ خواردن ئەمەش بۆ ترسان لە خواردن دەگەڕێتەوە. بەرگریکردنی هیستریانە دژی خواردن بەهۆی ڕشانەوە. رەتکردنەوەی خواردن بە هۆی دڵەڕاوکێوە...
- **کارفرمانی جووڵە**، هەندێ جار راگرتنی جووڵە لە نەخۆشییە دەمارگیرییەکان دەبینرێ. لەبەرئەوەی لەم باسەدا گرنگی زۆر بەنەخۆشییە دەمارگیرییەکان دەدرێ بۆیە دەکرێ بڵێین ئەو نەخۆشییە دەلالەت لە هەڵچوون و شێوان و لادانی هەست دەکاتو مرۆڤ دووچاری ژانو ژوار دەکات. بێ ئەوەی ئەم نەخۆشییە هۆیەکی ئەندامیی لە پاڵەوە بێ... دووبارە بۆکارفرمانی جوڵە دەگەڕێینەوە وەک حەز لە رۆیشتن نەکردن بەهۆی بێهێزی توانا. ئەمەش لای ئەوانەوە بە دیاردەکەوێت کە ئەندامەکانی جووڵەیان دووچاری شەلەلی دەبێت وەک لە حاڵەتی هیستریا بەدیاردەکەوێت. هەروەها حاڵەتی هیستریا: کێشە ناشعورییەکانی ناوەوە بەرەو شێوانە هەستیو جوڵەییو غەریزی عەقڵی دەرەوە دەبات بەبێ هۆی ئەندامی...
- هەندێ جار راگرتن لەکارو پیشە روودەدات. وەک پشتگوێ خستنی کارو هەندێ دیاردەی رەتکردنەوە وەک ماندووبوون (سەرسوڕان و رشانەوە) لەکاتی شێوانی کەسێتی

بەهۆی بەردەوامبوون لەسەر کارکردن وەک لە هیستریا بەدیاردەکەوێت. یاخود کاتێ بەردەوامبوون لە کارکردن بەهۆی شەلەلبوون مەحاڵ دەکەوێتەوە. یاخود بەهۆی شێوانی بیر. کارکردن مەحاڵ دەکەوێتەوە وەک لە دەمارگیری قەهری یان دەمارگیری زۆر لێکردن دەبینرێ. یاخود رۆشتن. هەموو ئەوانەش بە راگرتنی دەمارگیرییەوە پەیوەستن. چونکە ئەو ئەندامانەی لەو یاریانەوە بەشداری دەکەن لە وزەی سێکسی تێردەبن.

بەمجۆرە وەزیفەی هەرئەندامێک دەبێتە دیاردە بۆ شێوانەکان. ئەگەرهاتوو وزە سێکسییەکە زیاد بکات. یاخود دەلالەتە سێکسییەکە زیاد بکات. ئەمەش دەکرێت بەو ژنە نۆکەرە بچووێنین کە لە ئاشپەزخانەی ماڵێ کاردەکات. کاتێ هەستدەکات پیاوی ماڵەکە چاوبازی لەگەڵدا دەکات. ئاشپەزخانەکە فەرەمۆش دەکاو بەجێدەهێڵێت.

کەواتە نووسینیش هاتنە خوارەوەی مادەیەکی شلە لە نووکی قەڵەم بۆسەر کاغەزێکی سپی. ئەمەش دەلالەت لە جوتبوون دەکات یان رەمزی جووتبوون دەگەیەنێت. یاخود رۆیشتن بە دەلیلێکی رەمزی دەژمێردرێت بەسەر جەستەی دایکدا. جا پێویستە هەریەک لە نووسینو رۆیشتن راگرین چونکە دەلالەت لە پرۆسەیەکی سێکسی قەدەغەکراو دەکەن. نیگۆ ئەو وەزیفەیە رەتدەکاتەوە چونکە دووچاری شێوانی دەکات. رەتکردنەوەی نیگۆش بە هۆی کەبتکردنەوە ئەنجام دەدرێ.

لە دووتوێی هەموو ئەوانەدا دەکرێ بڵێین راگرتن (الكف) پێکهاتووە لە بێهێزکردن و سنوردانان بۆ وەزیفەکانی نیگۆ. ئەوەش یان بۆ پارێزگاریکردن دروست دەبێ. یاخود بە هۆی بێهێزی سێکسی دروست دەبێت. هەر لە دووتوێی ئەو مانایەش بە سانایی راگرتن و دیاردەکان لێکجیادەکەینەوە. واتە دیاردەکان نە ئەو کردارانەن کە لە نێو خودەوە دەسازێن. نە دەتوانن کاریگەریان بەسەر خودەوە هەبێت.

(2)

دیاردەکان دەرکەوتەیەکن کە دەلالەت لە ئارەزووە تێرنەبووەکان دەکەن. تێربوونی ئەلتەرناتیڤیش بۆ ئەو ئارەزووانە لە دەرئەنجامی چەپاندنەوەیە. بێگومان چەپاندنیش لە

ئیگۆوە سەرهەڵدەدات ئەو کاتەی رەمزی (رەنگە بە فرمانی سوپەر ئیگۆوە بێ) بەشداریکردنی بارگە دەروونییە غەریزییەکان دەکات. کە لە (ئید-هو) هەڵدەقوڵێت. بەمجۆرە ئیگۆ دەتوانێ ئەو بیرە قەدەغە بکات کە رەمزە بۆ پاڵنەرە نامەعقولەکان. شیکردنەوەکان وارروونی دەکەنەوە کە بیرەکە لە زۆر باردا لە ناشعور دەمێنێتەوە. ئێمە لێرەدا پرسیاری سەرەکیمان ئەوەیە ئایا ئەو پاڵنەرە غەریزەییە کە لە ئیدەوە دەردەچێت و داوای تێربوون دەکات چی بەسەر دێت؟ بۆ وەڵامی ئەو پرسیارە ناکرێت راستەوخۆ بێن. چونکە ئەو چێژەی کە دەکرێ لە ئەنجامی تێربوون بێتەدی بۆ بێزاری و پەژارە دەگۆڕێت ئەویش لە رێگەی کرداری چەپاندنەوە. بەڵام ئایا ئەو بێزارییە چۆن روودەدا؟ رەنگە بە شێوەیەکی گشتی بتوانین ئاماژە بەو پرۆسەیە بدەین ئەگەر گوتمان چەپاندن دەبێتە هۆی بەتاڵنەبوونی ئەو ورووژانانەی کەلە (ئید) سەرهەڵدەدەن. بەو مانایەش ئەکرێ بێزاری راستەوخۆ بە ئیگۆوە پەیوەست بکەین چونکە خودی ئیگۆیە کە چەپاندن دەسازێنێ. بەمجۆرەش ئیشکالیەتی (گۆڕینی وزە ویژدانیەکان) لەناو دەچێت. خودی ئەو لەناوچوونەش لە ژێر کاریگەری کرداری چەپاندن ئەنجام دەدرێت. بەئەنجام ئەگەیشتنی ئەو ورووژێنەرانەی کە لە (ئید)ەوە دەردەچێت دەلالەت لە سەرکەوتنەکانی ئیگۆ دەکات. ئەو سەرکەوتنانەش بە دەسەڵاتی ئیگۆوە پەیوەستە. ئیگۆش ئەو دەسەڵاتە بە هۆی پەیوەندییە بەتینەکانی بە ئەندامەکانی درککردنەوە بەدەست دەهێنێت. ئەو پەیوەندییەش جەوهەری ئیگۆیەو هۆی سەرەکی لێکجیابوونەوەی ئیگۆیە لە (ئید) هەروەها وەزیفەی ئەندامە دەرکییەکان – هەستی دەرککردن- بە دیاردە هەستییەکانەوە پەیوەستە، هەر ئەویش پێشوازی وریاکردنەوە دەکات. جاچ لە دەرەوە بێت یاخود لە ناوەوە....هەر ئەوەش هەوڵدەدات لە رێگەی هەستەکانی چێژو بێزاری کەوا لەو لایەنەوە پێی دەگات چالاکییەکانی خۆی بەپێی رێککەوتنەکانی پرنسیپی چێژ رووبەڕوو بکاتەوە. واتە ئیگۆ بەپێی پرنسیپەکانی چێژ کاردەکات. ئێمە لەو حاڵەتەدا ئیگۆ بە لاواز دەدەینە قەڵەم. بەڵام ئەگەر ئیگۆ لەگەڵ پرۆسە غەریزەییەکان تێککیربوو. ئەوەی لەسەریەتی ئەوەیە کە ئاماژەی بێزاری بنوێنآ تاکو بە مەبەستەکانی خۆی دەگات بە یارمەتی ئەو پرنسیپەی کە دەلالەت لە توانایەکی رەها دەکات ئەویش پرنسیپی چێژە، لێرەدا پرسیارێک دێتە ئاراوە ئەویش ئەوەیە: ئایا ئەو توانایەی بۆ ئیشارەتکردنی بێزاری (پەژارە) بەکاردەهێنرێت لە کوێوە

بێ؟ دەکرێت وەڵامی ئەو پرسیارە بەیارمەتی ئەو بیرە بهێنینەدی ئەویش بەرگریکردن لە کردارەکانی ناوەوە (ناخۆش) دەکرێ بەپێی ڕێڕەوی بەرگریکردن بێت دژی وریاکردنەوەی دەرەوە. واتە ئیگۆ بەتەنها وەک ئامرازێک ڕووبەڕووی ترسەکانی دەرەوەو ناوەوە دەبێتەوە. لە دووتوێی ترسی دەرەوە کەسەکە کۆمەڵێک هەوڵ بۆ هەڵاتن دەدا ئەویش لەڕێگەی کشانەوەی بارگە دەروونییەکانی خۆیەوە. یاخود بە مانایەکی تر لە شوێنی ترسەکە دوور دەکەوێتەوە. چەپاندنیش هەمان حاڵەتی دوورکەوتنەوەیە لە ترس. ئیگۆ بارگە دەروونییەکان لە پاڵنەرە غەریزییەکان دەکێشێتەوە کە دەیەوێت کەبتی بکات. پاشان خودی ئەو بارگەیە بۆ بێزاری بەکاردەهێنێ. لێرەدا بۆمان ئاشکرا دەبێ کە ئیگۆ سەرچاوەی سەرەکی دڵەڕاوکێیە.

بەڵام لێرەدا خەڵێک هەیە ئەویش ئەوەیە ئێمە دەڵێین دڵەڕاوکێ لە زیادبوونی بارگە دەروونییەکانەوە سەرهەڵدەدات. باشە کشانەوەی ئەو بارگە دەروونیانە لەلایەن ئیگۆ کامە دڵەڕاوکێ دەسازێنێ؟. (فرۆید) بۆ وەڵامی ئەو پرسیارە دەڵێت: **ئێمە ناوا ناکرێ سەیری ئەو مەسەلەیە بکەین چونکە دڵەڕاوکێ دەگەڕێتەوە بۆ حاڵەتە ویژدانییەکە، ئەو حاڵەتەی کە پێشتر لە یادەوەریدا ماوەتەوە، بەو مانایەش ئێمە دەبێ بۆسەرچاوەی دوور بگەڕێینەوە، سەرچاوەی ئەسڵی بۆ نموونە لە حاڵەتەکانی هیستریادا دەکرێت بڵێین هەر لە نۆبەیەک لە نۆبەکان بارێکی هاوشێوەی باری لەدایکبوون دووبارە دەبێتەوە(٣).** (ئەگەرچی ئەوەش لە هەموو بارەکاندا جێگیر نییە). دەکرێت لەسەر ئەو پرنسیپەش بڵێین هەموو حاڵەتەکانی چەپاندنیش بۆ چەپاندنی یەکەم دەگەڕێتەوە. بەڵام بێگومان لە کەبتە دووەمەکان سوپەر ئیگۆ دەوری خۆی تیا دەبینێ. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ناتوانین دەرکەوتەی سوپەرئیگۆ بە سنووری جیاکەرەوەی نێوان چەپاندنی یەکەمو چەپاندنی دووەم بدەینە قەڵەم. بێگومان حاڵەتەکانی چەپاندنی یەکەم بەر لە سەرهەڵدانی سوپەرئیگۆوە دەسازێ. لەلایەکی تریش ڕەنگە وریاکردنەوەی توندو سەرنەکەوتنی ئەو ئەندامانەی کە پارێزگاری دەکەن دژی وریاکردنەوەکان هۆی ڕاستەوخۆی چەپاندنی یەکەم بن. ئاماژەکردنی ئەو ئەندامەی پارێزیش. دەکرێت دووجۆر لە ((چەپاندن))مان بۆ دەربخات. یاخود دوو حاڵەتمان بۆ دەربخات: کاتێ کە دەرککردنەکانی دەرەوە بە ورووژانی

پاڵنەرە نامەعقولەکان هەڵدەستن. کاتێ ئەو پاڵنەرە غەریزەییانە بێ وروژانی دەرەوە دەخرۆشێ.

لە لایەکی تریش دیاردەکان لە ناکامی رەنجاندنی پاڵنەرە غەریزەییەکان بە هۆی کەبتبوونەوە دروست دەبێت. ئەگەر ئیگۆ توانی ئاماژەی پەژارەو بێزاری بەکاربباتو بە مەبەستی خۆی بگاو بەتەواوی پاڵنەرە غەریزییەکان داپلۆسێت. ئێمە لەو بارەدا ناتوانین بزانین چۆن ئەوە روودەدا. بەڵام تەنها دەکرێت شتێ بزانین کە پرۆسەی چەپاندن تیایدا سەرکەوتنی وەدەست هێناوە ئەو شتەش بە شێوەیەکی گشتی سەرنجمان بۆئەوە رادەکێشێت کە پاڵنەرە غەریزەییەکان سەرەڕای کەبتکردن تێربوونێکی ئەلتەرناتیڤ دەدۆزنەوە. ئەو تێربوونەش بە پلەیەکی بەرز بۆ لاوازیو جێگۆڕکێ (الابدال)و راگرتن دەگەڕێتەوە. واتە لەو تێربوونە ئەلتەرناتیڤە هەست بە چێژ ناکەین (٤). کەواتە بۆ بەدواداچوونی جێگۆڕکێ یان ئاڵوگۆڕکردن دەبێ بڵێین ئەو حاڵەتە کردارێکی ئەستییە کاتێ نارەزوو گیردەخوا. یان دەچەپێنرێ (کەبت دەکرێ) بۆ پەیداکردنی شتێ ئەو کاتە نارەزوومکە بەرەو شتێکی نزیک لەوی پێشوو دەجوڵێ. کەواتە لێرەدا بۆمان دەردەکەوێت کە لەو تێربوونە ئاڵوگۆڕکردنەدا هەست بە چێژ ناکەین. بەڵکو بە پێچەوانەوە خەسڵەتی دووبارەکردنەوە (قهر) وەردەگرێ. لێرەدا کاتێ ئیگۆ بە کەبتکردن هەڵدەستێ لە ژێر کاریگەری واقیعی دەرەوە. ناهێڵێ تێربوونی بەدیل هیچ کاریگەریەکی لەسەر واقیعی دەرەوەدا هەبێ. بەمجۆرە ئیگۆ دەسەڵاتی خۆی رووبەڕووی ناوەوەو دەرەوە دەکاتەوە. هەروەک چۆن دەسەڵاتی خۆی رووبەڕووی غەریزەکان دەکات بەهەمان شێوەش رووبەڕووی رەمزی غەریزەکانیش دەبێتەوە. کەواتە هەمیشە چەپاندن بە پێی توانای خۆی رێگە لە پرۆسەی تێربوونی بەدیل دەگرێت و ناهێڵێت کرداری دامرکانەوە بەرێگەی بەدیل رووبدات ، کرداری دامرکانەوەش دەلالەت لە بەرەڵاکردنی وەزە هەڵچووە. چەپێنراوەکانی لای تاکو بەتاڵکردنیان دەکات بۆ ئەوەی نەبنە هۆی شڵەژانی دەروونی دەمارگیری.

(3)

ئیگۆ هەرچەندە دەکرێت لە ئید جیابکرێتەوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بە ئید بەستراوەو بەشێکی جیاکارە لە ئید. ئەگەر لەبەرامبەر گشت چاو لەو بەشە ببڕین، یان ئەگەر لە نێوانیان جیاکردنەوەیەکی حەقیقی بسازێ بێهێزی ئیگۆ بە روونی بەدیاردەکەوێت. هەمیشە هێزی ئەویش لە پەیوەستبوون بە ئیدەوە بەدیار دەکەوێت.

ئیگۆ لە یەکەیەکی ڕێکوپێک پێکهاتووە، بەڵام ئید یەکەیەکی ڕێکوپێک نییە. هەروەها دوژمنی یەکتریش نین، کەواتە ئیگۆ ئەو بەشە ڕێکخراوەیە لە ئید. بەڵام دەکرێت لەکاتی ململانێدا لە یەکیان جیابکەینەوە. هەروەها کاتێک ئیگۆ بە چەپاندنی بەشێک لە ئید هەڵدەستێت بەشەکەیتر کەماوە بۆ ڕزگارکردنی بەشی هەرەشەلێکراو دەچێتە پاڵ ئیگۆ لەوێدا خەباتدەکات. رەنگە ئەوبارە لەزۆربەی جار ڕووبدات، بەڵام هەرگیز لەیەکەمجار (یەکەم حاڵەتی کەبتکردن) ڕووناداتـ لە لایەکی تریش ئەو پاڵنەرە غەریزەییەی کە کەبت دەکرێت هەمیشە گۆشەگیرە، ئەگەرچی پرۆسەی کەبتکردن دەلالەت لە هێزی ئیگۆ دەکات بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لاوازی ئیگۆ لەلایەکیتر ئاشکرا دەکات، هەروەها ڕوونی دەکاتەوە کەچۆن ئیگۆ توانای دەسەڵاتی بەسەر پاڵنەرە غەریزەییە گۆشەگیرەکەوە نامێنێ، چونکە کاتێ پرۆسە عەقڵییەکە لە ئەنجامی کەبتکردن بۆ نیشانە یان دیاردە دەگۆڕێن لەدەرەوەی ڕێکخراوی ئیگۆدا دەمێننەوە، ئازادن، لە واقیعدا هەرتەنها پرۆسەکە نییە کە لەدەرەوەی ئیگۆ چێژ لە ژیان وەردەگرێت بەڵکو هەموو دەرهێنراوەکانی تریش ئەو چێژە وەردەگرن، هەرچەندە جارێک ئەو پرۆسە (پرۆسەی خۆدانەپاڵ ئیگۆ) دووبارە بێتە بەشێک لە ئیگۆ لە خۆیان دەگرن، واتە ئەو پرۆسەیەو بەرهەمەکانی لەسەر حیسابی ئیگۆ پارچەکانی خۆیان بەرفراوان دەکەن.

دیاردەکان وەک تەنێکی غەریبن، بەردەوام لە نێو ئەوشتانە کە تیایدا نیشتەجێبوونە بە وروژانو وریاکردنەوەو وەڵامدانەوە هەڵدەستن، هەندێ جار خەبات دژی پاڵنەرە غەریزەییەکان لە شێوەی دیاردە کۆتایی بە خۆی دەهێنێ. ئەمەش لە حاڵەتەکانی هیستریای گۆزاندن (التحولیه) (لە حاڵەتی ئەو هیستریایە کێشە ناشعورییەکان دەگۆڕێن بە شێوانی هەستیو عەقڵی و جوڵەیی و غەریزی دەرەوە) واتە ئەوەی کە لە واقیع ڕوودەدات لە ئەسڵی مەبەست جیایە، هەروەها کاتێک پرۆسەی کەبتکردن دەسازێ چەند مانۆڕێکی سەختو بێپایان دەستپێدەکات، خەباتی خۆیان (کە دژی پاڵنەرە غەریزەییەکانە) بۆ خەبات دژی

دیاردە دەگۆزنەوە. لەم خەباتە دووەمیەدا ئیگۆ دوو ڕێڕەوی جیاواز دەگریتەبەر: ئیگۆ بەهەندێ هەوڵ هەڵدەستێ تاکو بگەڕێتەوە باری پێشووی خۆی. یاخود وەک هەوڵێک بۆ چاکسازی ئەنجامی دەدات. لەمەشدا بەپێی سروشتی خۆی دووچاری شێوان دەبێت. بەڵام لەبەرئەوەی ئیگۆ ڕێکخراوێکە هەمیشە لە بنەڕەتدا پشت بە ئازادی پەیوەندییەکانی نێوان بەشەکان دەبەستێ و هەوڵی تێکەڵاچوونو ئاڵوگۆڕی نێوانیان دەدات. ئەگەرچی هێزەکەی لە خەسڵەتە سێکسییەکان ڕووت دەکرێتەوە. بەڵام تانێستاش شوێنی بەرایی ئەو بەهێزی یەکتاپەرستیو دانان هەر دیارە. هەرچەندە هێزی ئیگۆ زیاد بکات ئارەزووی دووبارەکردنەوەی دانانی زێتر دەبێت. بۆیە ئاساییە قەدەغەی دیاردەکان بکاو ئەهێڵێ لە گۆشەگیریو تاکێتیدا بمێنێتەوە. بۆ ئەو مەبەستەش هەموو ڕێگایەک دەگرێتە بەر تاکو دیارەکان بەجۆرێک بەخۆوە پەیوەست بکاتو بۆ ڕێکخراوەکەی خۆی بیگێڕێتەوە.

بۆ نموونە دیاردە هیستریەکان وا دادەنێ کەوا ڕێکەوتنێکە لە نێوان ئارەزووی تێربوونو ئارەزووی سزادان. نموونەی ئەو دیاردانەش بە جێبەجێکردنی ئارەزووەکانی سوپەرئیگۆوە پەیوەستە.

ئیگۆ وا لەکەسێتی دەمارگیری قەهری (دووبارەکردنەوە) دەکات کە خۆی خۆش بوێ چونکە لەو پاکتر نییە. یاخود کەسێکی ((بارانۆیا))و وەهمەکانی. هەروەها هەموو ئەوانەی کە لەوەوە سەرهەڵدەدات بە سوودی دووەمینی دەمارگیری دەژمێردرێت. ئەو سوودە دووەمییە کۆمەکی ئیگۆ دەکات تا دیاردەکان بۆ ئەو بگەڕێتەوە. بەو مانایەش هەڵسانی ئیگۆ بەدروستکردنی دیاردە تەنها بۆ سوودەکانی دەگەڕێتەوە ڕێڕەوی دووەم پێکهاتووە لە چەپاندنی بەردەوام بێ ئەوەی زیادەڕۆیی تیادا بێت. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئیگۆ گرنگی بە دژایەتی دادەتو حەز لە ئاشتی دەکات و حەزدەکات دیاردەکان بگێڕێتە دووتوێی ڕێکخراوی خۆی. لەگەڵ ئەوەدا شێوانەکان لە دیاردەکانەوە سەرهەڵدەدەن کە بە بەرهەم و بەدیلی حەقیقی پاڵنەرە کەبتکراوەکە دەدرێنە قەڵەم و هەمیشە ڕۆڵی پاڵنەر دەنوێنن و دوای تێربوون دەکەون و وا لە ئیگۆ دەکەن کە لە ڕێگەی هەڵوێستی بەرگریکردنەوە ئاماژەی بێزاری ببەخشێ و یاخود بهێنێتە ناوەوە...

(4)

ترسی یەکەم یاخود حاڵەتی (هانز) کە بە ترسەوە. پەیوەستە ترسی نەخۆشی هیستریە، واتە ترسی (هانز) لە ئەسپ نموونەیەکە هەموو خەسڵەتە سەرەکییەکانی تێدا دەبینرێت. بەڵام لێرەدا پێویستە بزانین: ئایا پاڵنەری چەپێندراو کامانەیە؟ دیاردەی ئەلتەرناتیف کە ئەو پاڵنەرە لە خۆدەگرێت چییە؟ ئایا سەرچاوەی پاڵنەر بۆ چەپاندن کامانەن؟

[هانز چوونە سەر شەقام ڕەتدەکاتەوە بەهۆی لە ئەسپ ترسان].

لێرەدا ئایا کام بەش دیاردەیە؟ ترس؟ یان هەڵبژاردنی بابەتی ترس؟ ئایا وازهێنان لە ئازادی جوڵە، یان هەموو ئەوانە پێکەوەن؟ پاشان ئەو چێژە کامانەیە کە ڕەتی دەکاتەوە؟ بۆ ڕەتی دەکاتەوە؟.

دەکرێت بڵێین حاڵەتەکە هێندە ئاڵۆزو لێڵ نییە. ترسی (هانز) لە ئەسپ بێ بەڵگە هێنانەوە دیاردەیە. ئەچوونە دەرەوەشی دەگەڕێتەوە بۆ بەندکردنی یاخود تاکو حاڵەتی دڵەڕاوکێی ئەوڕۆژی ((یاخود دەگەڕێتەوە بۆ ڕاگرتن (الکف) کە لەم گفتوگۆیەدا باسی ناکەین)).

(هانز) لەئەسپ دەترسێ، بەڵام ئایا ئەو ترسە ئاشکرا نییە. ئەو لەئەسپ دەترسێ وادەزانێ گازی لێدەگرێت، دەکرێ ئەو ترسە لە بازنەی هەست (شعور) دووربکەینەوە. بە ترسێکی دیارینەکراو بیگۆڕینەوە. لەو حاڵەتەدا دڵەڕاوکێ و بابەت هەر دەردەکەون. کەواتە ئەو بیرە کاکڵی سەرهەڵدانی دیاردەیە؟

با هێندە دوورنەکەوینەوە چونکە لە میانی چارەسەرکردندا دەرکەوت کە (هانز) بە گرێی ئۆدیبدا گوزەری کردووە لە دووتوێی ئەو حاڵەتەشدا غیرەو مەیلی دوژمنکارانەی ڕووبەڕووی باوک گرتۆتە خۆ. (هەرچەندە باوکی زۆری خۆشدەوێت) بەومانایەش لێرەدا ئایک دەستی لە وروژانی ئەو ڕقەدا هەیە. لە خودی ئەو حاڵەتەدا دژایەتییەکی ویژدانی لە نێو هانزدا دروستبووە، ئەو دژایەتیەش لە نێوان خۆشەویستی قوڵو ڕقی تووندا یەکانگیر دەبێت. کەواتە ترسی نەخۆشی لای هانز دەلالەت لە حەلکردنی ئەوکێشەیە دەکات، ئەو حاڵەتە دەکرێت دەرئەنجامێکی نموونەیی بگرێتە خۆ. ئەویش بە توندی یەکێکیان بۆ نموونە ( سۆزی خۆشەویستیی)و لەناوچوونی سۆزەکەی تر. دەکرێ پەرگرییەتی ئەو سۆزەیتر کەماوە. خەسڵەتە دووبارەکردنەوەکانی بدۆزینەوە، ئەو سۆزە هەرتەنها خۆی نییە،

بەڵكو هەمیشە بۆخۆی لەحاڵەتی ئامادەباش و ووریایی دایە. تاكو دەستی بەسەر سۆزەكەی ترەوەدا زاڵ بێت. یاخود تاكو بتوانێت سۆزەكەیتر دابپۆشێت. لە دووتوێی ئەو كاردانەوەیەدا لە ئیگۆ. دەتوانین ئەو پرۆسەیەی كەپێی دەڵێین كەبتكردن بسەلمێنین. بێگومان كاردانەوە یان پەرچەكردار لێرەدا بەو رێچكەو حەزە شعورییانە دەگوترێ كە لە ئیگۆدایە دژی هەندی پاڵنەرو مەیلی نامەعقول دەوەستن بەو مانایەش پەرچەكردار پرۆسەی بەرگرییە كە ئیگۆ بۆ پارێزگاری خۆی لە پاڵنەرە ناشعورییەكان و نا مەعقولەكان پێی هەڵدەستێت.

دەكرێ بڵێین حاڵەتی (هانز) هیچ پەرچەكردارێكی لەو جۆرەی تیا بەدیناكرێ. هەروەها لێرەدا زۆر رێگای جۆراوجۆر هەیە بۆ رزگاربوون لەو كێشەیە دژ بەو یەكەی كە ویژدان دەوروژێنێ.

هەروەها لێرەدا دەتوانین دەربارەی (هانز) خاڵێكی دی دەرك پێبكەین ئەویش پاڵنەرە غەریزەییە چەپێنراوەكانەكە. دەلالەت لە پاڵنەرە دوژمنكارەكانی دژی باوك دەكەن. ئەگەر بۆ تحلیلی ئەوەش بگەرێینەوە (فرۆید) دەڵێ: جارێك (هانز) ئەسپێك لەكاتی كەوتن دەبینێ. هەروەها هاورێیەكەی خۆیشی دەبینێ لەگەڵ یاری ئەسپۆكەكەیدا دەكەوێ و بریندار دەبێت. لە شیكردنەوەی ئەوەدا دەتوانین بڵێین (هانز) خۆزگە دەخوازێ باوكی بكەوێت و بریندار بێت. هەروەك چۆن هاورێكەی كەوت و بریندار بوو. خوێی ئەو خۆزگەیەش راستەوخۆ بە گرێی ئۆدیبیەوە پەیوەستە. بەو مانایەش (هانز) كاتێ ئارەزوو دەكات بەسەر باوكیدا زاڵ بێت ئەوە راستەوخۆ دەلالەت لە غەریزەی كوشتنی باوكی دەكات.

تاكو ئێرە پەیوەندی لە نێوان غەریزە چەپێنراوەكانو دیاردە ئەلتەرناتیڤەكان دابینرێ كەوای بۆ دەچین لەوێنەی ترسی ئەخۆشی لە ئەسپ دیار دەكەوێت. ئەگەر بۆ ئاسانكردن و سادەكردنی حاڵەتی (هانز) رەگەزەگانی منداڵی و كێشە ویژدانییەكان بخەینە لاوە. دەكرێت وەك ئەو نموونەیە ئاشكرای بكەین: وای دانێ كە نۆكەرێكی بچووك هەندێ ئامازەی خۆشەویستی لای ژنی ماڵەكەوە پێدەگات. لەو حاڵەتە ئەو نۆكەرە لە پیاوی ژنەكە دەترسێ بۆ؟ چونكە وادەستدەكات پیاوەكە تۆڵەی لێدەكاتەوە. بێگومان بەتەواوی حاڵەتی (هانز) لەم جۆرەیە. بەلام ناتوانین دڵەراوكێی لەو ترسە بە دیاردە بدەینە قەڵەم. راستە (هانز) لە باوكی دەترسێ چونكە دایكی خۆشی دەوێت بەلام ئەوە حاڵەتێكی ناوەوەیە.

ئەگەر ئەو هەڵچوونەی ناوەوە بە دەمارگیری بچووێنین ئەوا لەو خاڵەدا دەکرێت باوک وەک ئەسپ چاو لێبکەیت. یان ئەسپ جێگای باوک پڕبکاتەوە. ئەو جێگۆرکێیە دەکرێ بە دیاردە ناوببرێ. ئەوەش ڕێگەیەکە بۆ حەلکردنی کێشەکانی ناوەوە کە لەمیانی دژایەتییە ویژدانییەکانەوە سەریهەڵداوە بێ ئەوەی پاڵ بداتە کاردانەوە. بەومانایەش دەکرێت بیری ئەوتەم وەیاد بهێنینەوە. لێرەدا دەبینین ئەو کێشەیەی کە لە میانی دژایەتییە ویژدانییەکانەوە سەریهەڵداوە لەناو دەچێت (ئەوکێشەیەی هانز بەباوکییەوە پەیوەست بوو) بەڵام کاتێک کێشەکە لە یەکێک لەو دوو پاڵنەرە دژبەیەکەوە بۆ کەسێکی تری بەدیل دەگوازرێتەوە. لێرەدا لە میانی ئەو گواستنەوەیە لەناو دەروونی (هانز) ئەسڵی مەبەست حەل دەبێت یاخود بەدیلێک بۆخۆی دەدۆزێتەوە.

ترسی (هانز) لە ئەسپ دەگەڕێتەوە بۆ گازگرتن. چونکە (هانز) وا هەست دەکات ئەسپەکە گازی لێدەگرێت. دەکرێ ئەو حاڵەتەش لە لاوە رووسییەکە نزیک بکەینەوە، کە بەڕای ئێمە هەردووکیان خەسڵەتی ئەلتەرناتیڤی باوکە. لاوە رووسییەکە خەونی دەبینی دوای ئەو خەونە وادەست دەکات یان لەوە دەترسێت گورگ بیخوات. ئەگەر لەحاڵەتی هانز باوکو یاری ئەسپینە فاکتەرێکی هەڵبژاردە بێت و دەوری لە دروستبوونی حاڵەتەکەی هانزدا هەبێت. یاخود رۆڵی لە ترسەکەی هانزدا بگێڕێ. دەکرێت بڵێین باوکی ئەو لاوە رووسییەش کاتێ گەمەی لەگەڵ کوڕەکەی کردووە لەمنداڵیدا لاسایی گورگی کردۆتەوە بەگاڵتە هەڕەشەی خواردنی کردووە. رەنگە لێرەدا بیری خواردنی منداڵ لەلایەن باوکە بیرێکی بڵاووکۆن بێت بۆ (ئەفسانەی کرۆنۆس) بگەڕێتەوە ئەو ئەفسانەیە یۆنانییەو ((کرۆنۆس. کۆنترین خواوەندی یۆنانەو لە سروشەوە پێی رادەگەیەنرێ کەیەکێک لە منداڵەکانی دەیکوژێ و شوێنی ئەو دەگرێتەوە. لەمەوە (کرۆنۆس) بڕیار دەدات هەموو کوڕەکانی خۆی هەڵلوشێت. بەڵام کاتێ (ریا)ی خێزانی منداڵێکی بەناوی (زیوس) دەبێت دەیشارێتەوە لەبری ئەویش بەردێکی پێدادەداو ئەویش هەڵیدەلوشێت. بەمجۆرە (زیوس) رزگاری دەبێت و گەورە دەبێت و هێرش دەکاتە سەر باوکی و لەناوی دەبات)) ئەوەش بۆمان روون دەکاتەوە کەوا بیری منداڵخواردن لەلایەن باوکەوە بەشێوەی هەڵگەڕانەوە تەعبیرکردنە لە ئارەزووی خۆشەویستی سلبی کەوا خۆشەویستی بەلای باوکدا دەکەوێتەوە شێوەیەکی سێکسی و رقیشی لە دایک دەبێتەوە.

دەکرێ سەرەڕای جیاوازییەکان (ئەم دووحاڵەتە) تارادەیەک لێک نزیکبکەینەوە. هەرچەندە هانز بەگرێی ئۆدیبی نیجابیدا گوزەری کردووە. هەروەها لێرەدا دەکرێت پرسیار لەو هێزە پاڵنەرە چەپێنراوە بکەین؟ بۆ وەڵامی ئەو پرسیارە دەکرێ بڵێین ئەو هێزە پاڵنەرە چەپێنراوە ترسە لە خەساندن. لەلایەکی تریش دەکرێ حاڵەتی هانز بۆ قوناغی مژین بگەڕێنینەوە. دەتوانین ئەو قوناغە بە شێوەیەکی لاواز ببینین و ترسی گازگرتن لەترسی مژین نزیک بکەینەوە. واتە گازگرتن لای هانز دەکرێت گازگرتن بێت لە ئەندامەکانی سێکسی یاخود ترس بێت لە خەساندن. بەمجۆرەش ترس لە خەساندن وا لە منداڵ دەکات بە پرۆسەی چەپاندنی گرێی ئۆدیب هەڵسێ.. لەلایەکیتر دەکرێ بڵێین کاکڵی بیری دڵەڕاوکێ لێرەدا ترسە لە گازگرتن ئەوەش گۆڕینی (تحریف) خەساندنەو ئەو بیرەیە کە هەوڵی کەبتکردنی دەدات. بەومانایەش کرداری کەبتکردن یان چەپاندن لە دڵەڕاوکێوە نییە کە ((فرۆید)) لەسەرەتا وابیری لێدەکردەوە ((دواتر بە چڕی دەیخەینە بەرچاو)) بەڵکو دڵەڕاوکێ لە خودی ئەو هێزەوەیە کە چەپاندن دروستی دەکات، لەو ترسەیە کە ڕەنگە هێرش بهێنێ. کەواتە دڵەڕاوکێ چەپاندن دەسازێنێ.

دەکرێ ئەوەش لە میانی گریمانەی قەدەغەکردنی جوتبوونو پچڕانی جووتبوون و وروژانی سێکسی یان ڕەتکردنەوەو دوورکەوتنەوە لەهەستی ئێگۆدا دەرک پێبکەین بەومانایەش ئێگۆ لەو حاڵەتانەدا هەست بەهەندێ ترس دەکات و ئەو ترسانەش لای ئیگۆ بە دڵەڕاوکێ وەڵامیان دەدرێتەوە، کەواتە دڵەڕاوکێ هەمیشە لە ئیگۆوە سەرهەڵدەداو دەبێتە هۆی چەپاندن. ئەو دڵەڕاوکێیەی کە لە ترسی ئاژەڵەوە سەرهەڵدەدات دڵەڕاوکێی ئیگۆیە بەرامبەر ترسی خەساندن.

(5)

ڕەنگە زۆر لە نەخۆشییە دەمارگیرییەکان دەرکەوتەی دڵەڕاوکێیان تیا نەبینرێت. بۆیە گەر بمانەوێت سەرهەڵدانی دیاردەکانو خەباتی دووەم باسبکەین کە ئیگۆ دژی دەبێتەوە دەبێت پەنجە بۆ هیستریای گۆڕاندن (تحویلی) درێژبکەین لە لایەکی تریش دەبێ دان

بەوەدابنێین کە دڵەڕاوکێ و سەرهەڵدانی دیاردەکان پەیوەندییەکی بەتینیان لەگەڵ یەکتردا هەیە.

دەکرێ لێرەدا دیاردە دیارەکانی هیستریای گۆڕاندن (تحویلی) بژمێرین وەک لەکارکەوتنی (شلل) جوڵەو گرژبوونەوەو کردەو هەڵچوونی خوێنەویستو ئازارو کۆڵینجکردن (تشنجات)و وڕێنە کە بە شێوەیەکی پچڕپچڕ یاخود بەردەوام ڕوودەداتو بە کردە بارگاوی کراوەکانی هێزی دەروونییەوە بەندە. شیکردنەوە بۆمان دەردەخات کە کرداری خرۆشان کامانەیە. بۆ لەخاڵیبوونەوە قەدەغەکراوەو شوێنی بە دیاردە پڕکراوەتەوە. هەروەها دەبینین ئەو دیاردانە لەکرداری خرۆشان خاڵیبوونەوە بەشداری خۆیان هەیەو هەموو هێزەکانی خرۆشاندنیان لەخۆیاندا چڕکردۆتەوە. بۆنموونە ئەو ئازارەی کە نەخۆش سکاڵای لێدەکات. لەکاتی ڕوودانی چەپاندن هەبووە. وڕێنەش لەوکاتەدا دەرککردنێکی هەستی بووە. لەکارکەوتنی جوڵەش بەرگریکردنە دژی کارێک کە دەیویست کاری خۆی بکات. بەڵام لە پاشان قەدەغەکراوە. گرژبوونەوەش دەلالەت لەو جوڵە ماسولکەییە مەعقولانە بەشێکی تری لەش دەکات. کۆڵینجکردنیش (تشنجات) دەلالەت لەو شۆڕشە ویژدانییە دەکات کە لەدەرەوەی کۆنتڕۆڵی ئاسایی ئیگۆ دایە .

ئیگۆ لەگەڵ ئەو دیاردانە واخۆی دەنوێنێ هەروەک ئەوەی پەیوەندی پێیانەوە نەبێت. هەروەها هەستکردن بەپەژارە لە دیاردە پچڕاوەکانو ئەو دیاردانەی بە هەستەوە بەندن بە ئاشکرا دەردەکەوێت. دەکرێت لەلایەکیتر بۆ زێتر بەدواداچوونی سەرهەڵدانی دیاردە پەردە لەسەر دیاردەی دەمارگیری هەڵدەینەوە ئەو دیاردانەش خۆیان لە دووجۆردا دەنوێنن: یان وێنەی سلبی یاخود تێرکردنێکی ئەلتەرناتیڤانە کە لە زۆربەی جاردا لە ژێر پەردەی ڕەمزی خۆی دەردەخات. هەروەها کۆمەڵەی دیاردە سلبییەکان یاخود بەرگرییە سلبییەکان بەراییترین کۆمەڵەن. بەڵام ئەگەر نەخۆشییەکە درێژەی کێشا. ئەو کۆمەڵە دیاردەی کە بە تێرکردن هەڵدەستن دەست بەسەر هەموو ئامرازەکانی تردا دەگرنو شوێنی یەکەم بۆخۆیان دیاریدەکەن.

دەکرێ لەدووتوێی دیاردەکانی (قهری- دووبارەکردنەوە) دوولایەن دەرکپێبکەین یەکەمیان: لێرەدا هەمیشە جەنگێکی ڕاگەیەنراو دژی شتە چەپێنراوەکان هەیە. هێزە کەبتکەرەکەش هەمیشە لەم جەنگەدا دۆڕاوە. بەڵام لایەنی دووەم: ئیگۆو سوپەرئیگۆ

بەشدارییەکی گەورە لە دروستبوونی دیاردەکان دەکەن. بێگومان دەمارگیری قەری (دووبارەکردنەوە) لەهەمان حاڵەتی هیستریا هەڵدەقوڵێ. واتە بەرپەرچدانەوەی نارەزووە سێکسییەکانی تایبەت بە گرێی ئۆدیب. هەموو دەمارگیرییەکی قەهری لە بنەڕەتدا بە هیستریاوە بەندە بەڵام لە سەرەتایەکی زووەوە. تا بەرەبەرە وێنەکەی دەگۆڕێ و بەپێی فاکتەری تایبەتیو سروشتی. لێرەدا مەبەستمان دەرکەوتەی هەڵگەڕانەوەیە (نکوص) کە لە ئەنجامی فاکتەرەکانی زەمەن بەدیاردەکەوێت بەو مانایەش هەڵگەڕانەوە (نکوص) کاتێ روودەدات کە تاکی هەرزەکار زروفی بۆ ناگونجێ بە شێوەیەکی ئاسایی و گەی و نارەزووە سێکسییەکانی ئەنجام بدات ئەوکاتە رووداوەکانە شێوە ساوایەتیەو سەرەتاییەکەی رەنگە هۆی سەرهەڵدانی هەڵگەڕانەوە بە جۆرێکیتر بۆ بەرگری نێگۆ بگەڕێتەوە. چونکە نێگۆ رووبەڕوو دەست دەکات بە بەرگری کردن. بەهۆی جێبەجێکردنی هەڵگەڕانەوەش نێگۆ یەکەم سەرکەوتنی خۆی رادەگەیەنێت. دەکرێت بڵێین لە حاڵەتی هیستریادا گرێی خەساندن هێزێکی بزوێنەرە بۆ بەرگریلێکردن. مەیلەکانی گرێی ئۆدیب ئەو شتەیە کە بەرگریکردن رێگای لێدەگرێت. لە سەرەتای قۆناغی متبونیشدا (الکمون) دەکرێت دەستبەسەر گرێی ئۆدیبدا بگیرێ ئەویش لە رێگەی سەرهەڵدانی سوپەر نێگۆو یارمەتی سوپەر نێگۆو دروستکردنی سنوورێکی واڵاکارو جوان لە نێگۆدا. بەمجۆرەش دەکرێ بەسەر گرێی ئۆدیبدا زاڵ بینو نارەزووە سێکسییەکان لە وێنەی هەڵگەڕانەوە (نکوص) یاخیبوونی خۆیان نیشان بەدەن. لێرەدا بەهۆی توندی تواندنی سوپەرنێگۆ. نێگۆ کۆمەڵێک بەرچەکردار بە فەرمانی ئەو دەنوێنێ وەک لە دەمارگیری قەهریدا دەبینرێت واتە دووبارە کردنەوەی کردارەکان هەمان دەلالەت لەخۆدەگرن. هەروەها ئەو خۆنواندنەی سوپەرنێگۆ رەنگە هەمیشە سەرکەوتن وەدەستنەهێنێ بە تایبەتی لە بەرەنگاریکردنی نارەزووی دەستپەر ئەمەش وێنەیەکی عەقلی هەڵگەڕانەوەیە بۆ قۆناغی متبوون دەگەڕێتەوە. واتە بەم وێنەیە دەست بەسەر گرێی ئۆدیبدا دەگیرێ. لە دووتوێی ئەم بابەتەشدا دژایەتییەک هەیە ئەویش دەستبەسەراگرتنی نێرێتیە (الـذکورة) لە پێناو مانەوەی خودی نێرێتیدا. لێرەدا کاری سەرەکی لەمانەوەی قۆناغی متبوون بەرگریکردنی نارەزووەکانە لە رێگەی دەستپەر، لەسەرهەڵدانی ئەو خەباتەشدا کۆمەڵێک دیاردە بە شێوەیەکی نموونەیی خۆیان دەردەخەن بەگشتی ئەو وێنانەش خەسڵەتی تەقس لەخۆدەگرن.

(6)

ئەگەر سەرنج لە ئیگۆ بدەین دەبینین لە ساتەوەختی خەباتدا بە دووکردار هەڵدەستێ لە دووتوێی دروستکردنی دیاردەکان. بێگومان ئەو دووکردارەی ئیگۆ جێگای گرنگی و لێدوانن چونکە نوێنەرایەتی چەپاندن دەکەن. بەومانایەش دەتوانین مەبەست و ڕێگاکانیان ئاشکرا بکەین. دەکرێت لە دەرکەوتەی ئامرازە کۆمەکەرو ئەلتەرناتیڤەکانەوە لە کۆسپ و تەگەرەگانی کەبتبوون بکەین. هەروەها ئێمە پێویستە بزانین کە ئیگۆ لە دروستکردنی دیاردەکانی دەمارگیری قەری زێتر دووچاری ماندووبوون دەبێت وەک لە هیستریا. لەوێ بە کۆمەڵێک نهێنییەوە پەیوەست دەبێت  تاکو بتوانێ پەیوەندی بە واقیع بکات لە پێناو ئەوەشدا هەموو توانا عەقڵییەکان بەکاردەبات تا دەگاتە ئەو رادەیەی کە خودی پرۆسەی بیرکردنەوە بە وزە سێکسیو دەروونی تێردەبێت یاخود پڕدەبێت لەو وزانە. هەر لە دووتوێی ئەو شتانەشەوە گرنگە ئەو دووئامرازەی کە لە کەبتبوونەوە دروستدەبێت بۆمان ئاشکرا دەبێت. ئەو دوو ئامرازەش پوچکردنەوەو دابڕان ((الغاء والعزل او الحصر)) واتە پوچکردنەوەی ئەو کردەیەی کە ڕوودەدات لەگەڵ دابڕین یاخود بە پەراوێزکردن و لێخستن. ئەو دووئامرازەش بە شێوەیەکی بڵاو بەکاردەهێنرێت و بۆ قۆناغەکانی بەرایی دەگەڕێنەوە. دەلالەت لەو سیحرە سلبیە دەکات کە بە ڕەمزبوونی جوڵە دەوری تیادا دەبینێ و ئەو بە ڕەمزبوونە هەوڵدەدات دەستبەسەر خودی ڕوداوەکەدا بگرێت. نەک هەر بەسەر دەرئەنجامی دیاریکراو یاخود بەسەر شارەزایی یان درککردن. لێرەدا ئەو ئامرازانە هەر تەنها لە ئەخۆشییە دەمارگیرییەکان دەور ناگێڕێن بەڵکو لە کردارە سیحرییەکان و دابونەریت و کەشە دینییەکانیشدا ڕۆڵیان دیارو لەبەر چاوە. لە دەمارگیری قەهریدا، کردەی پوچکردنەوە لەو دیاردانەوە دەردەکەون کە بە دوو قۆناغ دەردەکەون (یاخود دیاردە دوو ڕووەکانیان پێدەگوترێت) کە کردەی دووەم بە پوچکردنەوەی کردەی یەکەم هەڵدەستێ دەرئەنجامەکەش وەک ئەوەیە کە هیچ ڕووی نەدابێت. کەچی لە ڕاستیدا ڕوویداوە. ئەو پوچکردنەوەیە پاڵنەری بنەڕەتی دووەمە بۆ تەقسە دووبارەکردنەوەکان. بەڵام پاڵنەری یەکەم کردەی یەدەکەکانە کەوا ڕێگە لە ڕوداوی دیاریکراو دەگرن یاخود دووبارەکردنەوە قەدەغە دەکەن

لێرەدا ئەگەر ئامرازەکانی رەدیف یان یەدەگی (احتیاگ) مەعقول بێت بێگومان ئامرازەکانی دەستبەسەراگرتن لەناوبردنی شتەکان بەهۆی پوچکردنەوە نامەعقول و سیحرین.

کەسێتی دەمارگیری هەوڵدەدات بەهۆی جوڵە رابردووی خۆی کەبت بکات. بەو مانایەش هەوڵدەدا رابردووی خۆی پوچبکاتەوە یاخود رەتبکاتەوە. هەرلەمەشەوە کردارەکان بەناچاری دووبارە دەکاتەوە. ئەو دووبارەکردنەوەیەش بە شێوەیەکی بەربڵاو لە نەخۆشییە دەمارگیرییە قەهرییەکاندا دەبینرێ و کۆمەڵێک مەبەستی تڕ بەڕێوەیان دەبات. یاخود لە خزمەتی کۆمەڵێ نیازی دژدا خۆیان دەنوێنن. واتە لێرەدا ئەگەر نەتوانرێ شتێ لە رێگەی مەعقول جێبەجێبکرێت دەکرێت بە رێگەی جۆراوجۆر بە دووبارەکردنەوە رەشبکرێتەوە یاخود پوچبکرێتەوە. بێگومان لە دەمارگیری قەهریدا کرداری پوچکردنەوە شارەزاییەکی ئازاراوییەو یەکێکە لە گرنگترین پاڵنەرەکانی دروستبوونی دیاردە.

ئامرازی دووەم ئابڕین یاخود بە پەراوێزکردن. ئەوەش خەسڵەتێکی جیاکارەو لە دەمارگیری قەهریدا بەهەمان شێوە لە بواری جوڵەیدا روودەدات. بۆ نموونە دەبینین ئەگەر کەسێک شتێک بکات و ئەو شتە بە نیسبەت دەمارگیرییەکەی مەغزایەکی هەبێ. یاخود دوای ئەوە شتێکی خراپ روودبدات. دەبینین ماوەک بەسەریدا گوزەردەکات بێ ئەوەی بە هیچ شتێ هەڵبسێ- لە میانی ئەو ماوەیەدا. نە دەرک بە شتێ دەکات. نە بە هیچ شتێ هەڵدەسێ. هەر خێراش بۆی دەردەکەوێت کە ئەو رەفتارەی سەرەتا نامۆ بوو لەلای و پەیوەندی بەم کەبتبوونەوە هەبووە.

لە پێشتردا گوتمان دەمارگیری هەمان شتە بنەڕەتییەکانی هیستریای تیادا دەبنرێت بەڵام دواتر دەمارگیری دەردەکەوێت یاخود لەکاتی دەرکەوتنی سوپەرئیگۆ نامانەباشی تەواوی هەیە کەچی هیستریا زووتر دێتە ئاراوە. لە لایەکیتر لە هیستریا دەکرێت لە بیرچوونەوەی شارەزایی ئازاراوی گومڕا بکرێت. بەڵام ئەو شارەزاییە لە زۆربەی کاتەکاندا بە نیسبەت دەمارگیری قەهری واناکەوێتەوە یاخود لە بری ئەوەی ئەو شارەزاییە لە بیربکرێ لە چۆنێتییە ویژدانییەکە دادەماڵرێ و دەستبەسەر پەیوەندییە بەستراوەکانیدا دەگیرێ یاخود دەبڕدرێت وەک ئەوەی وەلاخرابێت یاخود بە پەراوێزکرابێت وای لێدەکرێ کە لەکاتی بیرکردنەوەی ئاسایی بەهانە بۆ دەرنەکەوتنی بهێنێتەوە. هەر لەسەر ئەمەشەوە

دەتوانین دەرئەنجامی وەلاخستن یان بە پەراویزکردن لە ریگەی لە بیرکردن وەک دەرئەنجامی کەبتکردن بدەینە قەڵەم.

ئەو ریگەیەی بۆ دەرکەوتەی وەلاخستن و دابڕین بەکاردەهێنریت وەک لە دەمارگیری قەهریدا دەبینریت. لە هەمانکاتدا بە ریگەیەکی سیحری لە بواری جوڵەدا پاڵپشتی دەکریت. هەروەها ئەو رەگەزانەی کە بەو ریگەیە یەکێک لەویتر جیادەکاتەوە هەمان رەگەزن کە پێکەوەیان دەبەستێتەوە. دەرئەنجامی بڕین یاخود وەلاخستن و پەراویزیکردنی جوڵەیی بڕینی (قطع) پەیوەندییەکانە لە ریرەوی بیرکردنەوەدا.

لە نەخۆشییە دەمارگیرییە قەهرییەکاندا ئیگۆ زیتر بێدارە. رەنگە بەهۆی کێشەی نێوان (سوپەرئیگۆ و ئید)و بەهۆی ئەو توندوتیژییەی ئەوان دەیخەنەوە ئیگۆ بەهەندی کرداری توندی وەلاخستن یان بە پەراویزکردن هەڵدەستێت. هەروەها لەسە ئیگۆ پێویستە کاتێ بە پرۆسەی بیرکردنەوە هەڵدەستێ بەرگرییەکی زۆر بنوینێ بۆ نموونە هاتنە ئێوەوەی خەیاڵە ناشعورییەکان یاخود دەرکەوتنی نارەزووە ویژدانییە دژەکان. هەروەها پێویستە ئەوەستێ و هەمیشە بێوچان خەبات بکات. ئیگۆ بەیارمەتی پرۆسەکانی دابڕین یان بە پەراویزکردنی. سیحری دووبارەکردنەوە بەهێز دەکات کە بە شێوەیەکی ئاشکرا لە دیاردەکان وەدەردەکەوێتو لای نەخۆش گرنگی تایبەتی خۆی هەیە. بەڵام لە واقیعدا هیچ ناگەیەنێت و خەسڵەتی تقوسی لەخۆ دەگرێت. بەڵام ئیگۆ بە هەوڵدانی قەدەغەکردنی پەیوەستبوونەکانی بیرکردنەوەو پەیوەندییەکانی سەربۆ فەرمانێک شۆڕدەکات کە کۆنترین فەرمانی دەمارگیری قەهرییەو رەسەنترینییانە ئەویش تاپوو دەستلێدانە یاخود قەدەغەکردن و دەستبۆبردنە. ئەگەر بپرسین بۆچی دوورکەوتنەوە لە دەستلێدانو یاخود پێگەیشتن یاخود بڵاوبوونەوە. ئەو رۆڵە کاریگەرە لە دەمارگیرییدا دەگێرێت. بۆچی بابەتە بۆ هەندێ رێکخراوی ئاڵۆز؟ وەڵام ئەوەیە کە نزیکبوونەوەو دەستلێدان و پێگەیشتنی جەستەیی دەلالەت لە دەرئەنجامی راستەوخۆی بارگە دەروونیە دوژمنکارەکان و بارگە دەروونیە تایبەتەکانی بابەتی خۆشەویستی دەکەن- ئیرۆس حەز لە پێگەیشتن و نزیکبوونەوە دەکات و دەیەوێت لە بابەتی خۆشەویستی نزیک بێتەوە تاکو خۆی و بابەتی خۆشەویستی ببنە یەک شت و ماوەیان لە نێوانیاندا نەمێنێ. خودی ئەو حاڵەتەش بە یەکەم پێداویستی لە ناوبردن دەژمێردرێت. ئەو لە ناوبردنەش بێ لێکنزیکبوونەوە هەرگیز سەرناگرێت

(بەرلەوەی چەکی دوور کوژ بدۆزێتەوە) پێگەیشتنی جەستەیی یاخود بەکارهێنانی دووردەست بۆ یەکتر لەناوبردن بەکارهێنراوە(٥). بەمجۆرە دەستلێدانی ژن یان نافرەت رێگەیەکەو تەعبیر لە دەرنەنجامی سێکسی دەکات. واتە ژن لەم دەستلێدانە وەک سێکس تەماشا دەکرێت. لێرەدا (دەستی بۆ نەبەیت) دەستەواژەیەکە دەلالەت لە قەدەغەکردنی تێربوونی نارەزووە هەلایساوە خوێییەکان دەکات و مانایەکی رووتی سێکسی دەگەیەنێت. لێرەدا دەبینین چۆن دەمارگیرییە قەهرییەکان لەدەستبردن دووردەکەونەوە بەمانا سێکسییەکەی پاشان راستەوخۆ دووچاری هەلگەڕانەوە (نکوی) دەبن (وەک لەمەوپێش لێی دواین) واتە لەم حالەتەدا لەدەست بۆ بردن دووردەکەونەوە بە توندی تاپوو یان قەدەغەی دەکەن. لێرەدا دابڕین و وەلاخستن یاخود بە پەراوێزکردنیشتەکە واتە دەست لێدانی دەوشتە ئەوەش ناشێ واتە پێگەیشتن قەدەغەیە. لەمیانی ئەو حالەتەدا کاتێ دەمارگیر بە پەراوێزکردنی یەکێ لە هەستەکانی یان کردەیەک لە کردەکانی هەلدەستێ، سەرەڕای هەندێ کات. ئەوە وامان لێدەکات بەشێوەیەکی رەمزی تێبگەین کەوا رێگەی ئەو بیرانەی خۆی نادات کە بەو کردارە یان ئەو هەستەی (کە پەراوێزکراوە) پەیوەستە تێکەلی بیرەکانی دیکەی ببێت.

(7)

لەمەوپێش هەندێ باسی ترسی منالانمان کرد لە ئاژەلان وەک نموونەش (هانز)مان هێنایە نێو بابەتەکەوە. لێرەدا دەمانەوێت بلێین لە حالەتێکی وادا لەسەر ئیگۆ پێویستە بەرگری ئەو نارەزووە سێکسییانە بکات کە لە ئیدەوە بەرەو رووی بابەتی خۆشەویستی دەبنەوە. ئەو نارەزووە سێکسییانەش بە گرێی ئۆدیبەوە پەیوەستە. یاخود بە مانایەکی دی بە تایبەتمەندێتی گرێی ئۆدیبەوە بەندە. ئەم ئاشکراکردنەش بۆ ئەوەیە تاکو گرێی ئۆدیبی ئیجابی و سلبی ئاشکرا بکەین. بەرەنگاربوونەوەی ئیگۆ راستەوخۆ لای (فرۆید) بۆ هۆیەکی سەرەکی دەگەڕێتەوە ئەویش ئەوەیە ئەگەر ئیگۆ سەر بۆ نارەزووە سێکسییەکان شۆڕبکات ئەوە ترسی خەساندن چاوەڕێمان دەکاتن بەلام ئەگەر بۆ (هانز)ی منال بگەڕێینەوە پرسیاری ئێمە ئەوەیە ئایا لای ئەو بابەتی خۆشەویستی (باوک)ە یان

دوژمنداریەتی (باوک) دەبێتە هۆیەک بۆ ئەوەی ئیگۆ بەرگری بکات. هەروەک ئەو حاڵەتە لە گرێی ئۆدیبی ئیجابی دادەنرێت. بەومانایە فرۆید دەیەوێت حاڵەتی (هانز)و گرێی ئۆدیب بەراورد بکات. چونکە هەریەک لە پاڵنەرەکانی خۆشەویستی بابەت و دوژمندارێتی باوک یەک ئەویدی دەگرێتەخۆ. بەم واتایەش ئەگەر دایک وەک بابەتی خۆشەویستی بە ئیرۆسییەت لە قەڵەم بدەین. پاڵنەری دوژمنکارانە دژی باوک لە بنەڕەتدا دەلالەت لە ساناتوس دەکات. ئەو دوو غەریزەیەش لە کتێبی (مافوق مبدأ اللذة) بە جوانی تەعبیری لێکراوە. لەلایەکی تریش لە حاڵەتی دەمارگیری ئیگۆ بەرگری لەخۆی دەکاتو بەرامبەر غەریزەی لیبدۆ دەبێتەوە. بەومانایەش نییە کەدژی هەموو غەریزەکانی دیکە ببێتەوە.

لای (هانز) کاتێک کەبتبوون دروست دەبێتو ترسی نەخۆشی سەرهەڵدەدات ئەوکاتە دەبینین خۆشەویستی بۆ دایک رەش دەبێتەوەو لە شوێن ئەوەدا دیاردەی بەدیل شوێنی پاڵنەرە دوژمناکارییەکە پردەکاتەوە. یاخود هەروەک لای لاوەکەو گورگەکە ئاماژەمان بۆ کردو گوتمان پاڵنەری کەبتکراو ئەو ئاراستە مێینیەیە کە بەرەو باوک رێژکە دەگرێت. هەروەها سەرهەڵدانی دیاردەکەش هەربەو پاڵنەرەوە پەیوەستە.

گوتمان (فرۆید) دواجار تەئکید لەسەر غەریزەی (ئیرۆس)و (ساناتۆس) دەکات بەو مانایەش قۆناغە یەک لەدوایەکەکانی رێکخستنی لیبدۆ کە پێشتر بروای پێهەبوو رەش دەکاتەوە. لێرەوە زێتر تەئکید لەسەر دڵەڕاوکێ دەکەینەوە هەروەک لە پێشتر گوتمان ئیگۆ نیشارەی دڵەڕاوکێمان پێدەگەیەنێت هەرکە درکی بەترسی خەساندن کرد. بۆ بەگرێکردنی خۆیشی بارگە دەروونیەکان ئەو بارگانەی کە لە ئیدەوە دەردەچێت کەبتیان دەکات. لەم کەبتکردنەشدا سیستەمی چێژو بێزاری بەکاردەهێنێ لەدووتوێی ئەو بارەدا ترسی نەخۆشی دروست دەبێت. بەمجۆرە دڵەڕاوکێی خەساندن ئاراستەکانی خۆی بۆ بابەتی جۆراوجۆر دەگوێزێتەوە. یاخود لە وێنەیەک بەرجەستەیان دەکات هەروەک لای (هانز) چۆن لە کازگرتنی ئەسپ یان لای لاوەکە لە گورگ خۆیان دەنوێنن لە میانی ئەو وێنە بەدیلانەش دوو سوود دەردەکەوێت یەکەمیان:ململانێ یان کێشەکانی نێو ویژدان دووردەخاتەوە. دووەم: ئیگۆ بەمجۆرە دەتوانێ رێگا لە دڵەڕاوکێ بگرێ. چونکە دڵەڕاوکێ دواتر ئەگەرچی لە دڵەڕاوکێی یەکەمەوە سەرهەڵدەدات. بەڵام لە حاڵەتی دواتر مەرجی دەبێت. بۆ نموونە لای (هانز) لە ئەسپ بەرجەستە دەبێت. واتە لە ئامادەباشی ئەسپەوە هەست بە دڵەڕاوکێ دەکات.

بەمجۆرەش هەست بە خەساندن ناکات چونکە باوک لەم حاڵەتە دیار نییە. ئەگەرچی منالّ لە باوک رزگاری نابێت چونکە هەرکاتێک بیەوێت باوک دەتوانێت نامادەبێت. بەلاّم کاتێک شوێنی بە ناژەڵێک پڕدەکرێتەوە لەوحاڵەتە منالّ دەتوانێ لە ترسی دڵەڕاوکێ خۆی دەرباز بکات ئەویش بە دوورکەوتنەوە لە ناژەڵی دیاریکراو. لێرەوە دەتوانین بۆ خۆ کۆتکردنی هانز بگەڕێینەوە بەو مانایەش حاڵەتی راگرتن (الکف) تایبەتە بە لەماڵ دەرنەچوون تاکو ئەسپ نەبینێ.

لێرەدا بۆمان دەردەکەوێت کە دڵەڕاوکێ کاردانەوەیە بۆ حاڵەتی ترس. واتە ئەگەر نیگۆ بتوانێ لەو حاڵەتە خۆی دووربخاتەوە. ئەوا لە دڵەڕاوکێ دەرباز دەبێت. جاچ حاڵەتەکە بەدەرەوە پەیوەست بێ وەک دوورکەوتنەوە لە ناژەڵان لای (هانز)و (لاوەکە) چ بە غەریزەکانی ناوەوە پەیوەست بێ. رەنگە غەرزەکانی ناوەوە هێندە ترسناک نەبن بەڵکو ترسناکی ئەوان لەوەدایە کاتێ بەرەو ترسی حەقیقی دەرەوەمان دەبەن ئەویش ترسە لە خەساندن. بەو مانایەش ئەوەی لە ترسی نەخۆشی روودەدات تەنها پێکهاتووە لە گۆڕینی ترسی دەرەوە بە ترسێکی تری دەرەوە.

ئەگەر ئێمە بڵێین دڵەڕاوکێ هەرتەنها لە ئیشارەتێکی ویژدانی پێکهاتووە. لەم حاڵەتە نیگۆ دەتوانێ لە ڕێگەی دیاردەکانەوە لە دڵەڕاوکێ خۆی دەرباز بکات. بەو مانایەش حاڵەتە نابوورییەکە هیچ کاریگەرییەک نابینێت. کەواتە ئەو دڵەڕاوکێیەی کە لە ترسی نەخۆشی (لە ناژەڵان) دەردەکەوێت دەلالەت لە پەرچەکرداری ویژدانی دەکات بەرامبەر ئەو ترسەی کە نیگۆ بەرەو ڕووی دەبێتەوە. ئەو ترسەی کە نیگۆ وریا دەکاتە ترسی خەساندنە. هیچ جیاوازییەک لە نێوان دڵەڕاوکێی بابەتێکی دیاریکراو (ئەسپ) نادیارکراودا نییە تەنها نادیاریکراوەکە ناشعوورییەو لە ڕێگەی بەرجەستەبوون لە وێنەیەکی دیاریکراودا بەرەو شعوری دەچێت.

ئێمە لێرەدا تارادەیەک باسی نەخۆشییە دەمارگیرییە قەهرییەکان و ترسەکانی نەخۆشیمان کرد هەر لە دووتوێی لێکنزیکبوونەوەیان دەتوانین بە یەکیان بچوێنین. هەروەک ئاشکراشە سەرچاوەی سەرەکی هەموو دیاردەکانی دەمارگیری قەهری ترسی نیگۆیە لە سوپەر نیگۆ هەرئەوەش بوو لە هیستریای جیادەکردەوە. بەلاّم ئەگەر بپرسین ئایا ئەو ترسە چییە کە نیگۆ لە ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ سوپەرنیگۆ دووچاری دەبێت.

بێگومان خودی ئەو ترسە دریژبوونەوەی ترسی خەساندنە کە دواتر کەسێتی باوک بەرەو وێنەی سوپەر ئیگۆ دەچێت. ئەو ترسەش (واتە ترسی خەساندن) هەڕەشەکانی خۆی لە دووتوێیەوە دەنێرێ دواتر بەرەو دڵەڕاوکێی (خلقی) یان کۆمەڵایەتی نادیار دەچێت. بەڵام ئەو دڵەڕاوکێیە نادیارە.

لە دەرئەنجامی ئەوەدا بۆمان دەردەکەوێت کە دڵەڕاوکێ کاردانەوەیە بۆ حاڵەتی ترس. ئیگۆ لە دووتوێی دیاردەکان ڕێگا لە دڵەڕاوکێ دەگرێ. یاخود بە واتایەکی دروستتر دیاردەکان بۆ ئەوە دروستدەبن تاوەکو مرۆڤ بە هۆی ئەوانەوە یان بەهۆی ورياکردنەوەی مرۆڤ لەلای ئەوانەوە خۆی لەترس بەدووربگرێت  یان بەهۆی دەرکەوتنی دڵەڕاوکێ مرۆڤ وریا ببێتەوە تا لەحاڵەتی ترس خۆی دووربخاتەوە. ئەو ترسەی کە ئێمە لێرەدا باسی دەکەین ترسە لە خەساندن... لە میانی قسەکاندا (فرۆید) دەیەوێت ئەو ترسە لەگەڵ ترسی مردن هاوشان بکات. لێرەدا ئەو حاڵەتەی کە ئیگۆ بەرامبەر مردن تیایدا دێتە وەڵام یاخود کە ئیگۆ رەتی دەکاتەوە وازهێنانە لە سوپەرئیگۆی پارێزەر بەو مانایەش ئیگۆ ڕووبەڕووی هەموو ترسەکانی دەوروبەر بەبێ پارێز دەمێنێتەوە. بەومانایە لە دووتوێی تێکشکانی بەربەستی پارێز دژی ورياکردنەوەکانی دەرەوە ڕێژەیەکی زۆر لە ورياکردنەوە بە کۆئەندامی عەقڵی دەگات. لەم حاڵەتە دەتوانین دووەم شیانەی دڵەڕاوکێ درک پێبکەین ئەویش ئەوەیە کە دڵەڕاوکێ هەر تەنها بە نیشارە ویژدانییەکان دروست نابێت. بەڵکو لە نوێوە لە وەڵامدانەوەی مەرجەکانی ئابووری دروست دەبێت (٦). کە لە حاڵەتێک لە حاڵەتەکان هەڵدەقوڵێ وەک لە دەمارگیری سەدمە (شۆک)دا  بەرچاو دەکەوێت...

ئەگەر تاکو ئێستا دڵەڕاوکێ نیشارەتێکی ویژدانی ترس بێتو ئەگەر ترسی ئێستا بە زۆری ترسی خەساندن بێت. کەواتە دڵەڕاوکێ پەرچەکردارە. یاخود کاردانەوەی گومکردنە ئەو گومکردنەش دەلالەت لە شتێک دەکات. یاخود جیابوونەوە لە شتێک. بەومانایە دڵەڕاوکێ دەبێت بە نیسبەت مرۆڤ دەلالەت لە (لەدایکبوون بکات) هەروەها لە دایکبوونیش لە واقیعدا جیابوونەوەیە لە دایک. بەومانایەش ڕەنگە بتوانین بەراوردی لەدایکبوون و خەساندن بکەین. ئەگەر هاتوو منداڵمان بە (چووک-کێڕ)ی دایک لە قەڵەمدا. لە دووتوێی ئەو حاڵەتەش دڵەڕاوکێ دەبێتە ڕەمزی جیابوونەوە.

لێرەدا (فرۆید) ڕەخنە لە بیروڕاکەی (ڕانک) دەگرێ و دەڵێت لە بەدبەختی ناتوانین سوود لەو پەیوەندییە وەربگرین. چونکە لە دایکبوون ناکرێت وەک جیابوونەوە لە دایک درک پێبکرێ چونکە کۆرپە ئەفێنراوێکی ئەرگسیە بەهیچ شێوەیەک وەک بابەتی خۆشەویستی درک بە دایک ناکات. هەروەها دەکرێ بەڵگەی دیکەی دژمان هەبێت ئەویش پەرچەکرداری لێکجیابوونەوە ئازارو خەمە ئەوەک دڵەڕاوکێ...

(8)

تاوەکو ئێرە ڕەنگە شتێکی وامان دەربارەی دڵەڕاوکێ نەگوتبێت. چونکە گوتن دەربارەی ئەو بابەتە هەروا بە سانایی بەرهەم نایەت. بۆیە دەکرێت بڵێین تائێرە چەند بیروڕایەکی دژبەیەکمان دەربارەی دڵەڕاوکێ لادروست نەبووە.

کەواتە دڵەڕاوکێ ئەو شتەیە کە هەستی پێدەکەین. ئێمە ناومانئا حاڵەتی ویژدانی. ئەگەر دڵەڕاوکێ حاڵەتێکی ویژدانی بێت کەواتە حاڵەتێکی بێزارکەرە، بەڵام بێزاری تەواوی چۆنێتی دڵەڕاوکێ پێکناهێنێ. هەموو بێزارییەکیش دەلالەت لە دڵەڕاوکێ ناکات. هەروەک دەزانین هەستیاری دیکە هەیە وەک ژانو گرژبوون یاخود غەم. کە ئەمانە چۆنێتی بێزاری لەخۆدەگرن یاخود بە مانایەکیتر بێزاریو پەژارە لەگەڵ خۆیان دێنن. کەواتە پێویستە دڵەڕاوکێ تایبەتمەندێتی دیکە لە خۆبگرێت.

لێرەدا بۆ هەستکردن بە دڵەڕاوکێ دووخاڵ دیاریدەکەین تاکو چۆنێتی پەژارەو بێزاری تایبەت بە دڵەڕاوکێ دەستنیشان بکەین: دەکرێت بڵێین کەوا ئەو حاڵەتە سیمایەکی تایبەت بەخۆی هەیە. شتێکی زۆر ڕوون نییەو ناتوانرێت بوونی بە تەواوی جێگیر بکەین. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دەکرێت بڵێین ئەو پەژارەو بێزارییە وجودی هەیە، هەروەها سەرەڕای ئەو سیمایە تەموژاوییەو نادیارە ئەگەر سەرنجی دڵەڕاوکێ بدەین هەندێ هەستیاری جەستەیی دیاریکراویش لەخۆ دەگرێت کە دەکرێ بۆ چەند ئەندامێکی دیاریکراوی بگێڕینەوە. چونکە لێرەدا گرنگی بە فیسیۆلۆژیەتی دڵەڕاوکێ نادەین. تەنها چەند نموونەیەک دەخەینە بەرچاو ئاشکراترینیان ئەو هەستانەن کە بە کۆئەندامی هەناسەدان و دڵەوە بەندە وەک لە بەرایی ئەو باسە نیشارەتمان پێکرد. ئەوەش دەلالەت لەوە دەکات کەوا دەمارە جولەییەکان یاخود

پرۆسەی بەتاڵبوون رۆڵی خۆی لە دەرکەوتنی دڵەڕاوکێی گشتیدا دەگێڕێت. کەواتە شیکردنەوەی حاڵەتی دڵەڕاوکێ بۆمان رووندەکاتەوە:

1- بوونی چۆنێتییەکی تایبەت بە پەژارە.
2- پرۆسەی بەتاڵکردن یاخود بەرەڵلاکردنی وزە هەڵچووەکان.
3- دەرککردن بەو پرۆسەیە.

ئەم دووخاڵەی دوایی جیاوازییەکانی دڵەڕاوکێ و حاڵەتەکانی دیکەی وەک ئەو (بۆ نموونە غەم ونازار) دیاری دەکەن. هەروەها ئەو حاڵەتانەی دوای هیچ دەرکەوتەیەکی جوڵەییان تیا بەدی ناکرێت. یاخود ئەگەر دەرکەوتەیەکی جوڵەیش هەبێت بەڵام وەک بەشێکی تەواوی حاڵەتەکە دەرناکەوێت. بەومانایە دڵەڕاوکێ حاڵەتێکی تایبەتە لە پەژارەو بە کرداری بەتاڵکردن پەیوەستەو رێچکەی دیاریکراوی خۆی دەگرێتەبەر بە پێی تیۆرە گشتییەکەی فرۆید دەکرێ بڵێین: دڵەڕاوکێ لەسەر زیادبوونی وریاکردنەوە دەوەستێت. لەلایەک هۆیەکە بۆ بێزاری یاخود چۆنێتی بوونی بێزاری و پەژارە لەلایەکی دیکە وەک نیشارەتمان پێکرد دەبێتە هۆی بەتاڵکردن لەمیانی رێرەوی تایبەتی خۆیدا.
فرۆید لەو باوەڕەیە کە هەڵچوونی دڵەڕاوکێ لە دووبارە هەڵچوونی دڵەڕاوکێی پێشوو پێکهاتووە کە خوودی تاک پێیدا گوزەری کردوە هەر لە دووتوێی ئەو مانایەش گرنگی بە ترسی یەکەم دەدات. ئەوەش لە پرۆسەی لە دایکبوونەوە دەستنیشان دەکات و بە شارەزایی و ژانو ئازاری یەکەم باری دەبەستێتەوە. هەرلەوێشەوە دڵەڕاوکێ سەرهەڵدەدات بەڵام ئەمەش مانای وانییە کە دڵەڕاوکێ جیابێ لە حاڵەتە ویژدانیەکانی دیکە، چونکە حاڵەتە ویژدانییەکانی دیکەش لە هەمان شارەزاییو ئازار پێکهاتووە. لێرەدا سەدەمەی لە دایکبوون دەبێتە نموونەی ئەسڵیو حاڵەتەکانی دیکە یاخود دواترو سیمای پەژارە وبێزاری هەر بۆ نموونە ئەسڵییەکەوە دەگەڕێنەوە.
ئەگەر ئەوەی باسمانکرد سروشتی دڵەڕاوکێ و ئەسڵی دڵەڕاوکێ بێت. لێرەدا پرسیارێک دێتە ئاراوە ئەویش ئەوەیە: وەزیفەی دڵەڕاوکێ و ئەو زروفەی کە تیایدا

دووباره دەبێتەوە کامانەن؟ وەڵامەکەی ئاسان و روونە: دڵەڕاوکێ وەک کاردانەوەی ترس دیاریدەکرێت. دووبارەش دەبێتەوە هەرچەندە حاڵەتی لەمجۆرەی ترس بسازێتەوە.

**بەڵام ئەی ترس چییە؟** لەکاتی لە دایکبوون ترسێکی راستەقینە هەڕەشە لە ژیان دەکات. ئێمە ئەگەرچی لایەنە واقیعیەکەی ئەو ترسە دەزانین. دەربارەی لایەنە سایکۆلۆژیەکەی هیچ بیرێکمان لانییە. هەروەها ناوەڕۆکی عەقڵی لای ئەو کەسە بە نیسبەت ترسی لە دایکبوون لە ساتەوەختی لە دایکبووندا وجودی نییە. هەروەها هیچ بەڵگەیەکمان بەدەستەوە نییە لەو ساتەدا کۆرپەلە دەرک بە هەڕەشەکانی ئەو ترسە بکات. تەنها دەتوانێ درک بە بەرزبوونەوەی لایەنە ئابووری وزە سێکسیە ئەرگزییەکە بکات لەو کاتەی کە چەندایەتێکی کەڵەکەکراو لە وریاکردنەوە هەستە نوێکانی بێزاری دەوروژێنێ: کۆمەڵێکی زۆر لە ئەندامەکانی جەستە بارگە ویژدانیە توندەکان وەردەگرن. هەر لەمەشەوە رێگە بۆ بارگە دەروونیەکانی پەیوەست بە بابەت خۆشدەکەن کە دواتر بە خێرایی دەستپێدەکات.

(ئارتۆرانک) بەهەمان شێوە سەدمەی لەدایکبوون بە گرینگ دەداتە قەڵەم بەڵام هەرگیز ئەو سەیری ئازارە جەستەییەکانی ئەو لە دایکبوونە ناکات. بەڵکو لەبری ئەوە راستەوخۆ بایەخ بە (جیابوونەوە) دەدات. خودی ئەو جیابوونەوەیەش بە چێژی یەکەم لە قەڵەم دەدات. واتە منداڵدانی دایک وەک بەهەشت وایە پڕە لە چێژوخۆشی و منداڵ لەنێو ئەو چێژو خۆشییە بەوپەڕی ئازادی دەژی بێ ئەوەی هەست بە ترسو ماندووبوون بکات. بەڵام کاتێک منداڵ لە دایک جیادەبێتەوە تەواوی ئەو چێژو خۆشییە لەدەست دەداتو دووچاری ترسی فیسۆلۆژی دەبێت. لێرەدا (رانک) ئەو جیابوونەوەیە بە دڵەڕاوکێی یەکەم لە قەڵەم دەدا. هەموو لێکجیابوونەوەکانی دواتر (لەشیرکردنەوە- چوونە قوتابخانە- زەواج) بەهەمان شێوە راڤە دەکات. کەواتە دڵەڕاوکێ لای (رانک) ئەو ترسەیە کە لە جیابوونەوە جۆراوجۆرەکانەوە دێتە بەرهەم. هەروەها دڵەڕاوکێی یەکەم لای ئەو دوو وێنە لە خۆدەگرێ کە بەدرێژایی ژیانی مرۆڤە. ئەویش ترسی ژیانو ترسی مردن. ترسی ژیان دەلالەت لەو دڵەڕاوکێیە دەکات کە لە میانی پێشکەوتنو سەربەستی تاکەوە هەڵدەقوڵێ. خودی ئەو ئازادیو پێشکەوتنە هەڕەشەی جیابوونەوە (لە تاک دەکات) لە پەیوەندییەکانی پێشوو دەکات. بەڵام ترسی مردن: بە پێچەوانەوەی ترسی ژیانە دەلالەت لەو دڵەڕاوکێیە دەکات کە لە میانی پێشکەوتن و ونبوونی تاکێتی دێتە ئاراوە. واتە ترسی تاکە لە ونبوون لە نێو

کۆمەڵ و لەدەستدانی ئازادی و پشتبەستن بەوانی دیکە.... هەروەها هەموو تاکێک ئەو دوو هەستەی لایە بە بڕوای (رانک) دەمارگیرییەکان ئەو کەسانەن کە ناتوانن ئەو دوو دڵەڕاوکێیە وەک یەک ڕاگرن.

(فرۆید) هەرچەندە تاڕادەیەک گرنگی بەو باسەی (رانک) دەداو وەک هەوڵێک لە هەوڵەکانی دەروونشیکاری حسابی بۆ دەکات. بەڵام لە هەمان کاتدا ڕەخنەی لێدەگرێت چونکە وای دەبینێ کە منداڵ درک بەو جیابوونەوەیە ناکات. یاخود ئەو هەستەی نییە (فرۆید) دەپرسێ ئەگەر وەبیرهێنانەوەی سەدمەی لە دایکبوون دڵەڕاوکێ دروست بکات باشە ئەو شتە چییە کەوا ئەو ڕووداوەی بیردەخاتەوە. یان چی لەو شتەوە دێتەوە یاد؟ بێگومان بە بڕوای فرۆید شتەکە لێرەدا گومکردنی بابەتە واتە (دایک) ئەو گومکردنەش ترسی ئێستا پێکدێنێ. چی لەو شتە دێتەوە یاد. ئەوەی لەو شتە دێتەوە یادی ڕاگەیاندنی نیشارەتی دڵەڕاوکێیە. ئەو نیشارەتەش. نیشارەتێکە بۆ ڕزگاربوون.. لێرەدا کاتێک منداڵ لە تاریکی دەترسێ یاخود کە لەگەڵ کەسێکی نەناسدا دەبێت هەست بە ترس دەکات. ئەوە بەو مانایە نییە کە (رانک) بڕوای پێیەتی ئەویش بە گەڕانەوەی ئەو حاڵەتەی کە لە نێو منداڵدانەدا بۆ منداڵ ڕەخساوە. بەڵکو ئەو ترسەی منداڵ دەلالەت لە گومکردنی بابەتی خۆشەویستی دەکات. لێرەدا گومبوونی دایک لەدەستدانی هەموو ئەو پێداویستیانەیە کە منداڵ لە دوای لەدایکبوون پێویستییەتی. ئەوەش دەکرێ لە ترسی خەساندنی نزیک بکەینەوە. چونکە لە دەستدانی چوک هەمان لەدەستدانە یاخود گومکردنە. بەو مانایەش (چوک) وەک ئەلتەرناتیڤێک -بۆ دووبارە یەکگرتنەوە لەگەڵ دایک- کەواتە پرۆسەی خەساندن یاخود بێ بەشبوون لە چوک واتە جیابوونەوە لە دایک.

(9)

لە نێوان دروستبوون و سەرهەڵدانی دیاردەی دڵەڕاوکێ دوو ڕای جیاواز هەیە. یەکەمیان دەڵێ: دڵەڕاوکێ دیاردەی دەمارگیرییە. بەڵام ڕایەکەی دی دەڵێ: پەیوەندییەکی پتەو لە نێوان هەردووکیاندا هەیە. بەپێی ڕای دووەم دیاردەکان بۆ دوورکەوتنەوە لە دڵەڕاوکێ دروست دەبن. دەکرێ بڵێین ڕای دووەم لە هەندێ باردا دروست دەکەوێتەوە بۆ نموونە:

ئەگەر یەکێک لەو ئەخۆشانەی کە لە شوێنی بەرفراوان دەترسن. بۆ شەقامیان بەرێت پاشان بە تەنها بەجێیان بهێڵێت، دەبینین دووچاری نۆبەی دڵەڕاوکێ دەبن. یاخود ئەگەر یەکێک لەوانەی دووچاری دەمارگیری قەهری بوونە، ڕێگایان پێ ئەدەی دوای دەست لێدانیان لە شتێکی پیس دەستیان بشۆن، دەبینین بە هەمان شێوە دووچاری نۆبەی دڵەڕاوکێ دەبن. کەواتە مەبەستو ئەنجام لە بوونی هاوڕێ لە شەقام و شوشتنی دەست دەلالەت لە دوورکەوتنەوەی دڵەڕاوکێ دەکات. بۆیە دەکرێت بڵێین ئەگەر دروستبوونی دڵەڕاوکێ بۆ ترس بگەڕێنینەوە، باشتروایە بڵێین دیاردەکان بۆ پارێزگاری ئیگۆ لە ترس دروست دەبێت. بەڵام ئەگەر ڕێگا لە دروستبوونی دیاردە بگرینو ترسەکە ڕووبدات. بەو مانایە هەمان حاڵەتی لە دایکبوون دووبارە دەبێتەوە، کەلە وێدا ئیگۆ بەرامبەر پاڵنەرە غەریزەییەکان کارناکات، ئەگەرچی بەردەوام توندی توونددی بنوێنرێت. ئەوەش دەلالەت لە حاڵەتی ئەسڵی دڵەڕاوکێ دەکات. بەو مانایەش پەیوەندی نێوان دڵەڕاوکێ و دیاردە توندو تۆڵی بە خۆوە دەبینێت. هەروەها دەکرێ بڵێین دروستبوونی دڵەڕاوکێ هۆیەکە بۆ دروستبوونی دیاردەکان. یاخود لەراستیدا مەرجێکی پێویستە، چونکە ئەگەر ئیگۆ بەهۆی دەرکەوتەی دڵەڕاوکێ کار بۆ وروژانی چێژو بێزاری ئەکات، توانای ئەوەی بۆ ناسازی کە دەستبەسەر ئەو پرۆسەیەدا بگرێ کە لە (ئید)ەوە دروست دەبێ و هەڕەشەی ترساندن دەکات. لەهەموو ئەو بارانەشدا ئیگۆ بۆ کەمکردنەوەی بڕی دڵەڕاوکێ بۆ کەمترین بار هەوڵدەدا. یاخود تاوای لێدەکات تەنها وەک نیشارەت بەکاربیرێت. ئەگەر زێتر لەوەش دابەزێنی لە شوێنی دی کە پرۆسەی سێکسی هەڕەشەی لێدەکات ئاڵەوێدا بێزاریو هەستی بێزاری دەسازێنێ. بەڵام ئەو دەرئەنجامە بە نیسبەت پرنسیپی چێژ باش ناکەوێتەوە. سەرەڕای ئەوەی ئەو حاڵەتە لە ئەخۆشییە دەمارگیرییەکان زۆر دەبینرێت.

کەواتە دروستبوونی دیاردەکان لە راستیدا حاڵەتی ترس لە ناودەبەن. ئەمەش بە دووجۆر دەکەوێتەوە، یەکەمیان: پەنهانە لە (ئید) ڕوودەدا. بە هۆی ئەو گۆڕنکارییەش ئیگۆ لە حاڵەتی ترس دوور دەکەوێتەوە، دووەمیان: بەهۆی دەرکەوتنی ئەو دیاردە بەدیلانەی کە لە میانی پرۆسە غەریزەییەکانەوە دێنە بەرهەمو دەگۆڕێن -واتە دەبنە بەدیل.

لێرەدا دروستبوونی دیاردەکان دەبنە بە دیلی پرۆسە سێکسییەکان. هەروەها ئەو بەشە دڵەڕاوکێیەی کە لەلایەن سوپەرئیگۆوە دروست دەبێ دڵەڕاوکێی کۆمەڵایەتی دەگەیەنێت و

نوێنەرایەتی بەدیلی ناوەوە دەکات بەرامبەر ترسی دەرەوە. ئەمەش وەک لە نەخۆشییە دەمارگیرییە قەهرییەکان دەبینرێت، کە لەوێدا ترسەکە بە شێوەیەکی بەرفراوان ترسە لە ناوەوە. بەڵام دڵەڕاوکێی زگماکی ترسەکەی هەمیشە بە تەواوی لەنێو خود دایە.

(10)

گوتمان دڵەڕاوکێ کاردانەوەی ترسە. بۆ ئەوەش دەکرێ بۆ سروشتی خودی ترس بگەڕێینەوە. پرسیاری ئێمە لێرەدا ئەوەیە بۆچی هەندێ کەس لەم ڕووبەڕووبوونەوەیە زێتر دەترسن لە هەندێکیتر؟

لای فرۆید ترس شارەزاییەکی مرۆڤە واتە لە سەدمەی لە دایکبوونەوە دێتە بەرهەم، ئەوەش بە نیسبەت هەموو کەسێک دەکرێ لە بنەڕەتدا وەک یەک سەیر بکرێت. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا فرۆید چەند بیروڕایەک دەخاتە بەردەم خوێندنەوە لەوانەش ((ئەدلەر-الفرد ادلر)) کە گرنگی بەهەست بەکەمیکردن دەدات و مانای دڵەڕاوکێ لە دووتوێی ئەو هەستەدا دەبینێتەوەو بە پاڵنەری سەرەکی نەخۆشییە دەمارگیرییەکانی دەژمێرێت. دەڵێ: هەمیشە ئەو تەرزە کەسانە لە ڕووبەڕووبوونەوەی گیروگرفتەکانیاندا کەوا ترسی بە دواوە بێ دووچاری سەرنەکەوتن دەبن. فرۆید کاتێ کە ڕەخنە لە هەستکردن بە کەموکوڕی (الشعور بالنقص) دەگرێت دەڵێ: ئەو تێزەمە بە تەواوی هەموو پێشکەوتنەکانی دەروونیشکاری فەرامۆشکردووە... هەروەها دەڵێ ئەگەر بە سەدمەی لە دایکبوون و تێزەمەکەی (ئرتورانک) بەراوردی بکەین، دەبینین سەدمەی لە دایکبوون زۆر پێشکەوتووترە. (ڕانک) بڕوای وایە کە دڵەڕاوکێ لە سەر بنەڕەتی جیابوونەوە لە دایک و بەمانا بایۆلۆژییەکەو پاشان واتە گومکردنی ڕاستەوخۆی بابەت. دواتریش گومکردنی بابەتە بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ. هەموو ئەوانەی دواتریش بۆ زەبری یەکەم دەگەڕێتەوە. فرۆید ڕەخنە لەو تێزمە دەگرێ و پێی وایە لەلایەنە تیۆرییەکەی نایخوات. چونکە لە لایەک کۆرپەلە درک بەو حاڵەتە ناکات لەلایەکی تریش کاریگەری پشتاوپشتگەرێتی (الوراثة) نابینرێت. لەلایەکی تریش نایا هەموو شیردەرەکان دووچاری دەماگیری دەبن چونکە وەک دەزانین هەموو شیردەرەکان

دووچاری هەمان حاڵەت دەبن. هەروەها (رانک) بەتەواوی غەریزە سێکسییەکان پشتگوێ دەخات.

(11)

کرداری کەبتکردن یاخود چەپاندن هەرتەنها رووداوێک نییە بەس. بەڵکو بەردەوام کاردەکاتو ئەو هێزە لەبار دەبات. بارگە دەروونییەکانیش دەلالەت لەو بەرگرییە دەکات کە هەمیشە بۆ پارێزگاری چەپاندن بەکاردەهێنرێت. دەکرێ ئەو بارە دەروونییە دژانە بەئاشکرا لە دەمارگیری قەهری (زۆرلێکردن) هەست پێبکەین ئەویش بە وێنەی کاردانەوە کە ئیگۆ پێی هەڵدەستێت.

هەروەها لە لایەکیتر ئێمە دەڵێین دڵەراوکێ لە پەرچەکرداری ترس پێکهاتووە (ترسی لە دەستدانی بابەت) هەروەها دەزانین کە یەکێک لە پەرچەکردارەکانی لەدەستدانی بابەت غەمە. مەسەلەکە لێرەدا بەمجۆرەیە. یەکەم: چ کاتێ لەدەستدانی بابەت بەرەو دڵەراوکێمان دەبات؟ دووەم: چ کاتێ بەرەو غەممان دەبات؟

بێگومان غەم خەسڵەتێکی نادیار لەخۆ دەگرێت. ئەو خەسڵەتەش هەندێ جار بۆ ئازاری تایبەت دەگەڕێتەوە. هەروەها هەوەک دەزانین جیابوونەوە لە بابەت شتێکی ئازاربەخشە. کەواتە لێرەدا دەکەوینە ئاڵۆزییەکی ترەوە: کەی لەدەستدانی بابەت بەرەو دڵەراوکێ دەچێت؟ کەی بەرەو غەم دەچێت – کەی بەرەو ئازار دەچێت؟

گوتمان کاتێ منداڵ لەگەڵ کەسێکی نامۆ دەبێ. یاخود بە تەنها دەبێ دووچاری دڵەراوکێ دەبێ. ئەویش بە هۆی گومکردنی بابەتە. بەڵام دڵەراوکێی ئەو ئاڵۆزترە. راستە دووچاری دڵەراوکێ بووە. بەڵام ئەگەر سەیری رووخساری بکەین یان لە گریانی بڕوانین. دەکرێت تەعبیر لە ئازاریش بکات. ئازاری جەستەیی ئەو ئازارەش بۆ (سەدەمەی لەدایکبوون)و (گومکردنی بابەت) دەگەڕێتەوە.

غەمیش جیابوونەوەیە لە بابەت. یاخود شوێنی جیابوونەوە لە بابەت دەگرێ. چونکە بە هۆی غەمەوە خۆبەتاڵکردن و بەرەڵڵاکردن روودەدات. یاخود بەتاڵکردن و بەرەڵڵاکردن. کشانەوە لە بابەت. چونکە لەو حاڵەتە بابەت دیارنییە .

کەواتە ئەگەر ئازار کاردانەوەی حەقیقی بابەت بێتو دڵەڕاوکێ پەرچەکرداری ئەو ترسە بێت کە بە گومکردنەوە بەندە. یاخود بە بەدیلەکەیەوە پەیوەست بێت. ئەکرێ تاکە زمانێک بۆ لێکنزیکبوونەوە یان ڕاستەوخۆ بە سەدمەی لەدایکبوونەوە پەیوەست بکەین.

## پەراوێزەکان:

1- فرۆید بە گومانەوە سەیری عەقڵ دەکات و پێی وایە مرۆڤ هەردەبێت بە ئازارو ئەندێشەو کێشەکێشو ململانێی دەروونییەوە بژێت. بەو مانایەش شەڕانگێزی غەریزەیەکی بایۆلۆژییەو هەرلەڕیشەوە دەتوانێ بەرامبەر غەریزەی ژیان ((ئیروس)) غەریزەی مردن ((ساناتوس)) دامەزرێنێ. ئەم بۆچوونە بەرەو ((دوالیتی))مان دەبات. مرۆڤ بەو مانایە دەبێتە هەڵگری غەریزەی ژیان و مردن واتە وەک بوونەوەرێکی بکوژ کاتێ بەرامبەری دەکوژێ خۆیشی دەکوژێت.

2- رەنگە بە جۆرێکی دیکە وریاکردنەوەو هوشیاری مۆرف بەژیارو کۆمەڵگای مەدەنییەوە پەیوەست بێ و بەومانایەش ژیار هەمیشە پرینسیپەکانی خۆی لەسەر دانووبوونو ژانو ژوارو چەوساندنەوەی تاک دادەمەزرێنێ. هەمیشە تاک لەبەرامبەر لێپرسینەوەی بەردەوامدایە. ئەگەر ئەو لێپرسینەوەیە لە لایەک بە ئیستاتیکاوە پەیوەست بێ. ئەوەی لەلایەکی دیکەوە راستەوخۆ بە هەنگاوە لەبنەهاتووەکانی کۆمەڵگاوە بەندە. واتە ژیار رۆحی دەستپێشخەری تاکو کۆمەڵگای لە دووتوێی خۆیدا هەڵگرتووە. بەمەش تاک بەرامبەی کۆمەڵگا دوو ئەرکی سەرەکی لە ئەستۆیە ئەرکێکیان رێزگرتنی یاساو رێساو رای دژو جیاوازە... دووەمیش بیرکردنەوەو دواندنی کردەکانە بەزمان بەرامبەر ئەرکی یەکەم. بەو واتایە کۆمەڵگا لە فراوانترین مانادا کۆمەڵگای ئیبداعییەو راستەوخۆ ئەوەش بە دڵەڕاوکێی تاکەوە بەندە. هەر لە دووتوێی ئەو دڵەڕاوکێ و نیگەرانییەش وابەستەگی سەلەفیانە دووچاری لە رزین دەبێت لە بەرامبەریشدا لە میانی سووتانی دەروونو بیرکردنەوەی تاکی پڕ بزاڤ و جوڵە رێگای جەنجاڵی پێشکەوتن رۆشن دەبێتەوە. کەواتە ئەگەر تاکی نێو ژیار بە هەنگاوە ئەسرەوت و سەرکێشەکانییەوە بەرەو نەزانراو بچێ و ئەو هەنگاوانەش دەلالەتی ترس وەک لە چەمکی فرۆید هاتووە لە خۆبگرێت. یان لەوشەی ((نەزانراو))ەوە هەڵقوڵابێ بەومانایە کۆمەڵگای ژیار هەمیشە ترسی ئایندە بەڕێوەی دەبات.

بەڵام وەک دیارە بیروڕای فرۆید بەرامبەر کەبتکردنو ژیاری ئەوەیە کە سەرکوتکردن یان چەپاندن ژیاریی لێدەکەوێتەوە. مارکۆزە ئەو بیروڕایە تا ئەندازەیەک بەرە پشتراستدەکاتەوە کە دوو جۆر سەرکوتکردن لە یەکجیادەکاتەوە یەکەمیان سەرکوتکردنی بنەڕەتییە ئەویدیکە سەرکوتکردنەکانی دیکەن. مارکۆزە پێیوایە سەرکوتکردنی بنەڕەتی بۆ پاراستنی شارستانییەت پێویستە بەڵام سەرکوتکردنەکانی دیکە بۆ هێشتنەوەی شێوەی تایبەتی دەسەڵاتی کۆمەڵایەتی دانراوە. بۆیە دەبێ بەرەنگاری بکرێت.

3- فرۆید پێی وایە سەدمەی لەدایکبوون ئەو بارەیە کە لە هیستریا دووبارە دەبێتەوە. بە مانایەکی تر حەزو ئارەزووە بە ئەنجام نەگەیشتووەکانی نێو ناشعور هەمیشە وەک یادەوەرییەک لە نەخۆشە دەمارگیرییەکان دووبارە دەبێتەوە ئەوەش بە ((اجبار التكرار)) ناودەبات بە مانایەکی دیکە تاک هەمیشە لە رووژانو شڵەژان دایە تاکو خاوبوونەوەو دامرکاندنەوە دووبارە بکاتەوە. ئەوەی لێرەدا چەسپاو ئەگۆڕە سەرچاوەو ئامانجەکانی غەریزەیە. بەڵام بابەتو هێزی بابەت لە گۆڕاندایە.

4- بۆ نموونە دەکرێ ئیشارە بە دەمارگیری وەسواسی بکەین کە سەرەڕای دووبارەکردنەوەی کردارە سەپێنراوەکان هیچ چێژێک بەدی ناکەن.
5- دووبارە سەرنجمان بۆ دوالیتی رادەکێشێ... بڕوانە پەراوێزی ژمارە (١).
6- دەلالەت لە بڕی وزەکانی لیبدۆو بڕی ترسی لەدایکبوون دەکات.

## بۆ سەرچاوەکان:

بڕوانە :
-1 الكف، العرض الحصر- سيگموند فرويد، ترجمة/ جورج طرابيشي. الطبعة الاولى بيروت- لبنان ١٩٨٢
-2 بۆ زیتر بەدواداچوونی دیاردە بڕوانە-:
النظرية العامة للامراض العصابية، ترجمة/ جورج طرابيشي. دار الطليعة/ بيروت.

# واتای دیارده لای فرۆید

ئەوەی لێرەدا گرنگی بە دەرکەوتەی دیاردەکانو ناوەڕۆکی دیاردەکان دەدات پزیشکی عەقڵی نییە. بەڵکو شیکردنەوەی دەروونی هەموو ئەو شتانە بە بایەخێکی زۆرەوە وەردەگرێتو دەزانێ مانای خۆی هەیە و لە دووتوێی ژیانی نەخۆشییەوە هەڵدەقوڵێ.

یەکەمین کەس کە دیاردەی دەمارگیری (العصابیە) دۆزییەوە (ج.برویر) بوو. توانی بە شێوەیەکی سەکەوتوو لە حاڵەتی (هیستریا) سوودی لێوەربگرێ. بە هەمان شێوەش دوای ئەو (ب.جانیە) هەمان شتی دۆزییەوە. بەڵام پێش (برویر) بڵاویکردەوە. ئێمە لێرەدا کارمان بەوە نانییە کە بۆ یەکەمجار کێ دیوویەتییەوە. چونکە لەو بڕوایەداین هەموو دۆزینەوەیەک زیاتر لە جارێک دەدۆزرێتەوە. بەڵام هەموو جارێکیش سەرکەوتن بۆ خاوەنەکەی ناگەڕێتەوە. ئەگینا دەبوایە ئەمەریکا بەناوی کۆلۆمبسەوە ناوزەند بکرابایە .

فرۆید دەڵێ: من لە میانی کارەکانمدا ماوەیەکی زۆر مەیلم بۆ لای (ب.جانیە) دەچوو. بە تایبەت کە دیاردەی (الاعراض) دەمارگیری بە بیرۆکەی ناشعورەییەوە ڕاڤەکرد. ئەو بیرۆکانەی کە خۆیان بەسەر نەخۆشدا فەرزدەکرد (واتە کردارە سەپێنراوەکان) بەڵام دواتر لەم بیرورایەی خۆی پارێزگاری کردو رایگەیاند کە ئەو زاراوەیە لە بۆچوونی ئەودایە (شێوەیەکی مەجازی) هەیەو لە دووتوێی واقیعدا هیچ شتێ لەخۆ ناگرێت. لەوکاتەدا من لە دەرئەنجامەکانی ناگەم.

کەواتە هەروەک هەڵەو خەون دیاردەی دەمارگیری واتاو مانا لە خۆدەگرێ. هەر لەو ماناو واتایەشەوە تەعبیر لە ژیانی کەسەکان دەکات. یاخود بە ژیانی ئەوانەوە پەیوەستن. لێرەدا هەوڵدەدەم ئەو بیرە بە یارمەتی هەندێک نموونە قبوڵ بفەرموون. بەڵام بەر لە هەموو شتێ دڵنیاتان دەکەم حاڵەتەکان بەدەر لە راستی نین. رەنگە ئەوەی خۆی دوای ئەو لێکۆڵینەوەو شیکردنەوانە بکەوێت لەمیانی ئەزموونەکانی خۆیدا بە تەواوی بڕوا بەو راستییە بێنێ.

فرۆید دەڵێ راستە (بروێر) ئەو بیرۆکەی بۆ حاڵەتی (هیستریا) بەکارهێناوەو سەرکەوتنی بە دەستهێنا. بەڵام من لەبری ئەوەی هیستریا وەک نموونە بێنمەوە. لەبەرهەندێ هۆ لە نەخۆشییە دەمارگیرییەکانەوە دەچمە ناو بابەتەکەوە. ئەو نەخۆشییە دەمارگیرییەش لە واقیعدا لە هیستریا نزیکن. ناوی ئەو نەخۆشییەش بە دەمارگیری وەسواسی دەبەین. هەرچەندە وەک هیستریا بڵاو نییەو خەڵکی زۆرشت دەربارەی نازانن (نەخۆشی دەمارگیری بە شێوەیەکی نادیار لە دووتوێی دەروونییەوە بۆ جەستە خۆی دەگوازێتەوە).

ڕواڵەتەکانی نەخۆشی دەمارگیری وەسواسی وادەکەوێتەوە: نەخۆش مێشکی بە بیرۆکەیەک خەریک دەبێت. خودی ئەو بیرو بیرۆکەیەش لە واقیعدا بۆ نەخۆش هیچ بایەخێک لەخۆ ناگرێت... بەڵام نەخۆش لە ناخەوە کار بۆ هاندانی دەکات. لەهەمان کاتیشدا ئەو بیرۆکەیە بۆ ئێستای نەخۆش شێوەیەکی نامۆ لە خۆدەگرێت. لەدووتوێی ئەو هاندانەشەوە نەخۆش هیچ خۆشییەکی دەست ناکەوێت. لەگەڵ ئەوەشدا ناتوانێ لەو کردارە خۆی دەرباز بکات. ئەو بیرۆکانە خۆیان دەسەپێنن بۆیە بە (بیری سەپێنراو) ناوزەد کراون. ئارادەیەکیش بێ مانان. یاخود بەجۆرێکیتر بە نیسبەت کەسەکە مانا هیچ گرنگ نییە. زۆربەی جاریش هیچ و بێهودە دەکەوێتەوە. واتە ئەو کارتێکردنانەی کە لە ناوەوەی

ئەخۆشدا کاردەکات منالّکارانەو بێهودەیە. لە زۆربەی کاتیشدا دەلالەت لە ناوەرۆکێکی ترسێنەر دەکات و ئەخۆش واهەست دەکات خودی ئەو بیرۆکەیە بەرەو تاوانێکی ترسناک پالی پێوەدەنێ. لێرەدا هەر ئەوە بەس نییە کە هاندانەکانی ناوەوە وەلانرێ (چونکە بۆ خودی ئەخۆش نامۆیە) بەلّکو ئەخۆش هەمیشە لەلایەک لێی رادەکاو هەترەشی لێچوورەو هەترەشی لێدەچێت. هەرچەندە ئەو کارە نارەسەن و تاوانانە کە ئەخۆش تەسەوریان دەکات ریگای خۆیان نابڕن بۆ جێبەجێکرنن (بە واتایەکی دی ئەو خەیالّە هەرتەنها لەنێو ئەخۆشدا ئەبێت لە واقیعدا وجودی نییە) لە کۆتایشدا ئەخۆش لە دووتوێی ئەو بیرۆکە سەپێنراوەدا هەمیشە رادەکا خۆی زیندانی دەکات. ئەو کردارانەی کە ئەخۆشیش بەهۆی ئەو بیرۆکانەوە دەینوێنێ. پێی دەگوترێ کردارە سەپێنراوەکان. خودی ئەو کردارانەش واتای خۆی هەیە. بەلام ئەو زیانە لە خۆناگرن کە ئەخۆش تەسەوریان دەکات. یان لە واقیعدا هیچ حیسابێکیان بۆ ناکرێت. لە زۆربەی باردا هەرتەنها دووبارەکردنەوەیە. یان رازانەوەیەکی ناهەنگسازانەی ژیانە. لەم کارە سەپێنراوانەش بۆ نموونە: دووبارەکردنەوەی شوشتن (بە تایبەتی دەست) یان دانیشتن و جل گۆرین و جل لەبەرکردن و سەیران... هەموو ئەوانەش کۆمەلێک تەکەرە لەخۆ دەگرن. لەهەموو شێوەکانی ئەخۆشی دەمارگیری وەسواسی و لە هەموو حالّەتێک لە حالّەتەکان ئەو بیرە سەپێنراوانە کاریگەری خۆیان هەیە بۆیە کردە ئەخۆشییەکان بەیەک شێوە تێکەلّ یەکتر نابن. بەلّکو لە هەموو شێوەکانی ئەخۆشی دەمارگیری وەسواس و لە هەموو حالّەتێک لە حالّەتەکاندا: لە زۆربەی جاردا یەکێک لە کردەوەکان لە نێو ئەوانی دیکە بۆ شوێن دەستی خۆی دەگەرێتەوە. ناوی دیاریکراو لەخۆ دگرێت –بەلام هەموو شێوەکانو حالّەتەکان بەروخساری هاوبەش بەشداری دەکەن. مەحالّە بەهەلّە بۆی بروانین.

ئەو ئەخۆشییە سەیرو سەمەرەیە. بۆیە پزیشکی عەقلّی هەرچەندە خەیالّی خۆی پێوە خەریک بکات ناتوانێ هیچ دەرئەنجامێک بەدەست بهێنێ. چونکە ئەو کردارانەی کە ئەخۆش دەینوێنێ لە ژێر دەسەلاتی دەمارگیری وەسواسیداو بارگاوییە بە هێزێکی گەورەی خەیالّ نەکراو. ناکرێ لە حالّەتی ئاسایی هاوشانێک بۆخۆی بدۆزێتەوە. ئەوەی کە دەتوانێ لەگەلّ واقیعدا لێکنزیکبوونەوەی بۆ بکرێت یەک شتە ئەویش گۆرینی ئەو بیرە بێهودەو هیچەیە بە بیرێکی سوکتر یان کەمتر. یان دەکرێت بەبیرێکی دیکە پارێزگاریو پاسەوانی

بکرێ. کەواتە ئەگەرچی لە توانادا هەیە ئەو پاڵنەرە، یان ئەو بیرۆکە سەپێنراوەو زۆرلێکراوە بگوازرێتەوە، بەڵام هەرگیز ناتوانن ئەو بیرە بەتاڵبکرێت. گواستنەوەی دیاردەکانیش واتە دوورکەوتنەوە لە شێوەی سەرەتایی ئەوەش یەکێکە لە سیماکانی نەخۆشی دەمارگیری وەسواسی.

لەپاڵ ئەو پاڵنەرە، یان بیرە سەپێنراوە وەسواسییە. ئەگەرچی ناوەڕۆکەکەی سالب (نێگەتیڤ) یان (پۆزەتیڤ) موجەب بێت. نەخۆش لە دووتوێی خۆیدا دووچاری گومان و نیگەرانیو دڵەڕاوکێ دەبێت. لە عەقڵیەتی نەخۆشدا گومانێک دەردەکەوێت. بۆیە هەوڵدەدات خۆی بە شتە جێگیرەکانەوە پەیوەست بکات. بەگشتی لە دەرئەنجامی هەموو ئەوانەشەوە نەخۆش دووچاری گومان و حەپەسان و سستی و سنوردانانی ئازادی دەبێت. واتە حاڵەتەکە چ بارێکی سالب لەخۆ بگرێت یان موجەب. نەخۆشەکە لە نێو گوماندا تلدەخوات.

لێرەدا فرۆید دەڵێ دوو نموونە دەهێنمەوە کە ماوەیەکی زۆر دووروودرێژ لە ژێر چاودێری مندا بوون ئەرکی چارەسەرکردنم لە ئەستۆ گرتبوو-:

ژنێک لە تەمەنی (٣٠)ساڵیدا بوو. بە شێوەیەکی زۆر ترسناک سکاڵای لە دیاردەی وەسواسی دەکرد. ئەو کۆمەڵە کردارە سەپێنراوە، کە لە میانی رۆژێکدا دووبارەی دەکردەوە بەڕاستی جێگای سەرنج راکێشان بوون. لە ژوورەکەی خۆیەوە بەهەڵەداوان خۆی دەگەیاندە ژوورەکەی تەکییەوەو لە شوێنێکی دیاریکراو بەرامبەر مێزی نانخواردن دەوەستا. ئەو مێزەش نێوەڕاستی ژووری داگیرکردبوو. لەم حاڵەتەدا بانگی نۆکەرەکەی خۆی دەکردو فەرمانێکی رادەگەیاند. جا هەرفەرمانێک بایە. ئینجا بەپەلە بۆ ژوورەکەی خۆی دەگەڕایەوە.

راستە ئەو دیاردە نەخۆشییە هیچ ترسناکی تیادا بەدی ناکرێت. بەڵام لەگەڵ ئەوەش جێگای خۆتێهەڵقوتانە. دەکرێ لە رێگایەکی راست و بێگومانیش بگەینە راڤەکردنی ئەو مەسەلەیە. بێ ئەوەی پزیشک بێتە نێوەوە. بەڵام من بێ ئەو نەمدەتوانی شتەکان ببینم. واتە نەمدەتوانی پێشبینی مانای ئەو کردە سەپێنراوانە بکەم. چونکە هەرچەندە لە نەخۆشم دەپرسی بۆ وادەکەیت؟ ئەو بە (نازانم) وەڵامی دەدامەوە. بەڵام دوای ئەوەی بەسەر نازێنینی دەروونیدا سەرکەوتنی وەدەستهێنا. بەرەبەر هەندێک راڤەکاری دادەست کە پەیوەندیان بە کارەساتی کردارە سەپێنراوەکەوە هەبوو. ئەو ژنە بەر لە (١٠) ساڵ شوی بە پیاوێک کردبوو کە زۆر لەو بەتەمەنتر بوو. لەشەوی بەزاوابوون ئەو پیاوە دووچاری چووک-کێر

هەڵنەسان بیوو. شەو هاتو رابورد ئەو پیاوە هەر لە نێوان ژووری خۆیو بووکدا لە هاتوو چۆکردندا بوو تا هەوڵی جووتبوون بدات. بەڵام دواجار بێ ناکام مایەوە. بۆیە لە بەیانی رۆژی داهاتوو شوورەکەی پێی دەڵێ (من شەرم لە نۆکەرەکە دەکەم. ئەو نۆکەرەی بە ریکخستنی جێگاکان هەڵدەستێ) بۆیە هەردووکیان بڕیار دەدەن شووشەیەک مەرەکەبی سوور بەسەر جێگاکەدا بکەن. بەڵام بەر ئەو شوێنە دیاریکراوە ناکەوێت کە دەبایە پەڵە خوێنەکەی لێبایە.. لێرەدا ئایا ئەو یادگارییەو کردارە سەپێنراوەکە چ پەیوەندییەکیان بەیەکەوە هەیە. ئایا چوونە ژوورەکەی دیکەو بانگکردنی نۆکەرەکە هەرتەنها دوو واقیعی هەتیوون، کە دەکرێت بە هەڵوێستی ئەسڵییەوە پەیوەستیان بکەین. ئەخۆشەکە بۆ ژووری دووەم پێشمکەوتو لەبەرامبەر مێزی نانخواردن رایگرتم. لەسەر چەرچەفی مێزەکە پەڵەیەکی سووری گەورەم بەرچاوکەوت. روونیکردەوەو گووتی من لە بارێکدا بەرامبەر ئەو مێزە دەوەستم کە نۆکەرەکەم لەکاتی بانگکردندا ناتوانێ بێ دیتنی ئەو پەڵەیە بێرەدا تێپەڕێت. بەمجۆرە گوومانم نەما. هەردووحاڵەتەکە. واتە دیمەنی شەوی بەزاوابوون و کردارە سەپێنراوەکە تێکئاڵابوون، بەڵام ئەو حاڵەتە زۆر شتی تریشی لێدەبێتەوە. ئەوەی ئاشکراو روونە ئەوەیە کە هەر لە سەرەتاوە ئەخۆشەکەمان خۆی لەگەڵ شوورەکەی تەماهی کردووەو لاسایی ئەو دەکاتەوە لە ژوورەکەی خۆیەوە بەرەو ژووری دووەم لە هاتووچۆکردنادایە. بەڵام تاکو ئەو لاسایی کردنەوە تەواو بکەوێتەوە. لەبری شوێنی نووستن و کەرەسەکانی خوانی نانخواردن وەک بە دیلێک بەکاردەهێنرێ. ئەوەش شێوەیەکی هەرەمەکیانە لە خۆدەگرێت. بەڵام ئامانەوێت لێکدانەوە بۆ رەمزییەتی خەون بە شێوەیەکی بێهودەییانە بە ئەنجام بگەیەنین (لە خەونیشدا دەکرێ رەمزی خوانی نانخواردن کە بەشێوەیەکی زۆر دەردەکەوێت بەدیلی شوێنی نوستن بێت) زەواجیش واتە جووتبوونی مێزی نانخواردنو شوێنی نووستن. لێرەدا بۆمان دەردەکەوێت کە کرداری سەپێنراو مانای خۆی هەیە. مانایەک دەنوێنێ کە دووبارەکردنەوەی دیمەنە راگەیانراوەکە نیشاندەدات. ئەو دیمەنەی کە لە دووتوێی دەلالەتی وەسفەکانییەوە خۆی نومایش دەکات. بەو مانایەش نییە کەوامان لێبکات بە رواڵەتەکان رازیبین. بەڵکو ئەگەر بۆ راڤەکردن خۆمان بخەینە ژێر پەیوەندی دیمەنە راگەیەنراوەکەو کردارە سەپێنراوەکە رەنگە تارادەیەک بتوانین دەستبەسەر کۆمەڵێک زانیاریو جێکەوتەی دووردا بگرینو نیازو مەبەستی کرداری سەپێنراویش لەم نێوانەدا

روونبكەینەوە. ناوەرۆكی ئەو مەبەست و نیازە. یاخود ئەوەی لێرە بە چاوو دەبینرێت:-
بانگكردنی نۆكەرەكەو سەرنجراكێشانی بۆ پەڵەكە تەواو پێچەوانەی دەستەواژەی (من شەرم لە نۆكەرەكەم دەكەم)ی شووەكەی دەبێتەوە. كەواتە ئەگەر ئەو رۆڵی شووەكەی وازی بكات دەڵێ: من شەرم لە نۆكەرەكە ناكەم. چونكە پەڵەكە لە شوێنی دیاریكراوی خۆیدایە. لێرەدا دەبینین ئەخۆشەكە بەلاسایكردنەوەی دیمەنەكە رازی نییە. بەڵكو راستی دەكاتەوەو بەسەركەوتوویی لەقەڵەمی دەدات. واتە دەیەوێت بڵێت: ئەخێر ئەوەی وایكرد پەنا بۆ مەرەكەبی سوور بەرێن چوك هەڵنەسان بوو. وەک ئەوەی كە خەونەكانی ئەو دیمەنە لە كردارێكی ئێستاییدا جێبەجێكرابێت. ئەوەش بە تەواوی كەوتۆتە ژێر هیواكانییەوەو هیراخوازە كە شووەكەی سەركەوتن بەسەر فەشەلەكەی پێشودا بهێنێ.
بەپێی ئەو یادەوەریانەوە هەموو ئەوشتانەی كە دواتر دەربارەی ئەو دەتوانین بزانین دەكرێ بە كردارە سەپێنراوەكە پەیوەستی بكەن. هەرچەندە ئەو نافرەتە چەندان ساڵە جیا لە شووەكەی ژیان بەسەردەبات. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بەرگری لەبەرەوابوونی شووەكەی دەكات. راستە لێرەدا بەنیسبەت ئەو بواری ئەوە نییە كە دەستلەملانێ لەگەڵ شووەكەی بكات. هۆكەی بۆ ئەو گومانە دەگەرێتەوە كە لە خۆیەوە وشەی بێزراو دەداتە پاڵ خۆی. واتە هەرچەندە لەسەر وەفایی خۆی ماوەتەوە بەڵام لەبەرئەوەی بێزراوە بۆیە ناكرێ پێكەوە بژین. واتە ئەو نافرەتە هەمیشە هەوڵدەدات پلەی شووەكەی لە خەیاڵی دانەبەزێت بۆیە هەمیشە لە دڵی خۆیدا بیانوو بۆ حاڵەتەكە دەهێنێتەوە. لەلایەكی دیكەش نهێنی ئەو ئەخۆشییە شاراوەیە وای لێدەكات كەوا هەمیشە شووەكەی لە قسەی خەڵكی بپارێزێ. بیانووش بۆ پێكەوە نەژیان دەهێنێتەوە. چونكە دەتوانێ بە جیا لەوەیش لە ژیانێكی خۆشدا بژی. بەمجۆرە شیكردنەوەی دەروونی بۆمان روونمدەكاتەوە كە كرداری سەپێنراو كە هیچ بەلامانەوە گرینگ نەبوو پەیوەستە بە ناوكی شاراوەی حاڵەتی نافرەتە ئەخۆشەكە. واتە ئێمە لێرە پەردەمان لە سەر كۆمەڵێك نهێنی دەمارگیری وەسواسی هەڵماڵی.
نموونەی دووەم تەواو جیایەو نموونەیەكە بڵاو. ئەویش ئەو تەقسەیە كە بەر لەخەوتن ئەخۆشەكەم پێیهەڵدەستێ.
كچێكی جوانكیلەی تەمەن (١٩) ساڵانەو پڕبەهرە. تاقانەی دایک و باوكییەتی. بەهۆی زیرەكی وزانیارییەكانییەوە توانی بووی بەسەر دایک و باوكیدا زاڵبێ. هەروەها لە منداڵیدا

خۆی بەگەورە دەھاتە بەرچاوو. ئەو کچە لەم چەند ساڵەی دوایدا بەبێ هیچ هۆیەک دووچاری حاڵەتێکی دەمارگیری بیوو تا رادەی نەخۆشبوون هەراسانی کردبوو. زیاد لە پێویست توندوتیژی رووبەڕووی دایکی نیشاندەدا. پاشان هەمیشە توندی دەنواندو بەرەو گومانو دڵەڕاوکێ دەچوو، تا وایلێهات بڕیاربدات کە هەرگیز ناوێرێت بەتەنها شەقام و گۆڕەپانی گەورە ببڕێت.

ئەمجۆرە حاڵەتە، حاڵەتێکی نەخۆشی ئاڵۆزەو بەلایەنی کەم دەکرێ بە دوو جۆر دەستنیشانی حاڵەتەکەی بکەین. یەکەم ترس لە شوێنی کراوەو دووەم دەمارگیری وەسواسی.

لە خاڵی یەکەم ناوەستین. بەڵکو ئەوەی بەلامانەوە گرینگە ئەو تەقسەیە کە نەخۆشەکە بەر لە خەوتن بۆخۆی سازیدەکات. هەرئەویش سەرچاوەی غەمو کینەی باوکو دایکێتی... رەنگە بە مانایەک لە ماناکان بتوانین بڵێین هەموو کەسێ دەکرێ بەر لە نووستن تەقسی دیاریکراو بەخۆی هەبێ. یان بەر لە خەوتن پارێزگاری لە نواندنی هەندێ کردار بکات. بێ جێبەجێکردنی ئەو کردارانەش خەوی لێنەکەوێت. کەواتە ئەویش هەموو شەوێ، هەندێ شێوە بە جۆرێکی حەرفی دووبارە دەکاتەوەو لە دووتوێی ئەو دووبارە کردنەوەیەشدا دەکەوێتە گواستنەوە لە حاڵەتی بێداری بۆ خەوتن. بەڵام مەرجی کەسی سروشتی کە دەکەوێتە ئەو حاڵەتە شێوەیەکی عەقڵانی لە خۆدەگرێت. لەسەر ئەم ئەساسەش قابیلی تێگەیشتنە. یاخود رەنگە پەیوەندییەکی پتەوی بە بارۆدۆخی دەرەوەدا هەبێت. بەمجۆرەش دەتوانێ خۆی لەگەڵیدا بگونجێنێ بێ ئەوەی کاتی خۆی لەدەست بدا. بەڵام تەقسی نەخۆشەکەی ئێمە توورندەو کۆمەڵێک قوربانی بەسەرخۆیدا فەرزدەکات. خۆشی دەخاتە پاڵ کۆمەڵێک هۆی بە رواڵەت مەعقول. رەنگە ئەگەر زۆر ورد نەبینەوە نەتوانین ئەو تەقسە لە تەقسی سروشتی جیابکەینەوە، بەڵام ئەگەر زێتر بەرەو ناوەوەی ئەو تەقسە دابچین و سەرنج بدەین دەبینین لە هەندێک مەرج پێکهاتووە کە هیچ بیانوویەک لە خۆناگرێت. هەندێ مەرجیش شێتانە دەکەوێتەوە، بیانووی ئەو رەفیفانە ((احتیاگات)) کە شەوانە نەخۆش پێی هەڵدەستێ وەک پێویستییەک بۆ خەوتنی بە هێمنی.و خۆ دوورخستنەوە لەو شتانەی کە ژاوەژاوییان لێدەکەوێتەوە. بۆ جێبەجێکردنی ئەو کارانەش بەر لەخەوتن هەموو شەوێ بەو رەفیفانە هەڵدەستێ:- وەستاندنی کاتژمێری هەڵواسراوی دیوار

لەکارکرین. وەدەرنانی هەموو کاتژمێرەکانی دیکە بێ جیاوازی. تا دەکاتە کاتژمێرە بچکۆلەکەی دەستی خۆیشی. پاشان کۆکردنەوەی لولەکو دینجانەی گوڵەکانی سەر کتێبخانە. بە شێوەیەکی وردو هۆشیارانە تاکو لەشەودا نەکەو نەخوارەوەو لەخەو بەئاگای بهێنن. ئەو دەزانێ نووستن هەموو ئەو شتانە ناهێنێ کە پێی هەڵدەستێ. هەروەها دەزانێ چرکەچرکی کاتژمێرە بچووکەکەی دەستی کە لەنێو قاوغی تایبەت بەخۆیدایە خەو لە چاوان نازڕێنێ. هەروەک دەزانێ چرکەچرکی ڕێکوپێکی کاتژمێری دیوار خەو لە چاوان ناکات. بەڵکو بە پێچەوانەوە ڕێکیدەخات. هەروەها دەزانێ ترس لە لولەو دینجانە لە واقیعدا هیچ بەڵگەیەک لە خۆ ناگرێت. بەڵام بەنیسبەت ژوورەکانی دیکە تەقسەکە پێچەوانەی هێمنییەکە داوادەکات دەرگای نێوان خۆیو دایکو باوکی بە کراوەی بمێنێتەوە. بۆ دڵنیابوونیش بە شتێ ڕاگیری دەکات. خودی ئەو ڕەدیفە دەبێتە هۆی ژاوەژاو نانەوە.. لەو ڕەدیفە گرینگانەی کە شوێنی داوڕبانەوەو سەرنجی زۆرە. پەیوەندی بە شوێنی خەوتنەوە هەیە: ئەو داهێڵێ سەرینی لای سەرەوە بە باهوە (عارضة) دارینەکە بکەوێت. سەرینە بچوکەکەی ژێر سەریشی بە شێوەیەکی دیاریکراو دەخاتە سەر سەرینە گەورەکەو سەریشی بە ئاراستەی نێوان درێژایی شێوە دیاریکراوەکە دادەخات.

بەڵام لەبەرئەوی لێفەکەی بە پەڕ ئاخنراوە. بۆیە سەرەتا بەرلەوەی بە خۆیدا بدات دەبێ هەڵیتەکێنێ تاکو لای خوارەوەی لەلای سەرەوە ئەستورتر بکەوێتەوە. بەڵام ئەو لە تەقسەکەی خۆیدا ئەو شتە داهێڵێ. واتە هەموو لایەک وەک یەک لێدەکات تاهیچ لایەک لە لایەکی دیکە ئەستورتر نەبێت. وەکو گوتمان هەموو ئەو کارانەش بە شێوەیەکی لە رادەبەدەر وردەکارانە ئەنجام دەدات. بەوردی هەوڵدەدات بە سەریاندا بچێتەوەو هەمیشە هەموو ئەو کارانەش نزیکەی کاتژمێرێک یان دوو کاتژمێر دەخایەنێت. لەو ماوەیەشدا دایکو باوکی ئەخۆش خەو ناچێتە چاویانەوە.

شیکردنەوەی ئەو کارە سەپێنراوانەی ئەخۆش و رقوکینەو بێزارییەکان هەروا بە ئاسانی دەستەبەر ئەکراون بەڵکو سەرەتا چەندان پرۆژەم بۆ لێوردبوونەوە پێشکەشی ئەخۆش کرد. بەڵام ئەو هەمیشە رەتی دەکردەوە. یاخود بە چاوێکی کەم سەیری پرۆژەکانی دەکردم. بەڵام دواتر پەرچەکرداری رەتکردنەوەکانی سەرەتا. قۆناغێکی گرینگی بە دوای خۆیدا هێنا. لەم قۆناغەدا کـچەکە بایەخـــــی بە شیمانە پێشکەشکراوەکان داو.

دەستپێکرد بە ئامادەکاری هەموو ئەو شتانەی کە بە دڵیا دەهات. بە گوێرەی شیمانەکان بەرەو بانەوەرییەکانو بونیادی جێکەوتەکەی رووداوەکانی گەڕایەوە لە دواجاریشدا هەموو راڤەکارییەکانی ئێمەی بۆخۆی دادەڕشتەوەو ئینجا قەناعەتی پێدەهێنا.. لەدەرەوەی ئەو پرۆسەیەشەوە ئەو هەمیشە ترسێک داگیری دەکردو بەوردی کردارە سەپێنراوەکانی وەک گوتمان جێبەجێ دەکردو پاشان بەرەبەرە ئەو کردارانە کەمبوونەوەو ئینجا بەرلەوەی بگەینە کۆتایی چارەسەرکردن دواجار وازی لە هەموو تەقسەکان هێنا..

هەموو ئەو راڤەکارییانەی لێرەدا پێشکەشی دەکەم هەرتەنها بەرهەمی چەند دانیشتنێک نییە بەڵکو لەکارکردنی چەندان هەفتەو مانگ هاتۆتە بەرهەم تا بەرە بەرە نەخۆشەکە درکی بەوەکرد کە نەهێشتنی کاتژمێر لەشەودا بۆخۆی دەلالەتی رەمزی مێینەیە بە شێوەیەکی رێکوپێکو لەماوەی یەکساندا بۆ نموونە ئافرەتان دەڵێن بینوێژی مانگانەمان وەک کاتژمێر رێکوپێکە. بەڵام وەک دیمان نەخۆشەکە پێشتر لەوە دەترسا کە چرکەچرکی کاتژمێر خەوی لەچاو بزڕێنێ. رەنگە ئەو چرکەچرکە بەشێوەیەکی رەمزی لێدانی (میتکە) لەحاڵەتی خرۆشانی سێکسی بنوێنێ. ئەو هەستە ورووژاوەش زۆرجار لەخەوی کردووە. لەلایەکی دیکەوە ترسان لە میتکە ترسانە لە بریندارکردن بۆیە سەرەڕای راوەستاندنی کاتژمێری دیوار لە هەموو ئەو کاتژمێرانەش دوور دەکەوتەوە کەکاریان دەکرد.

هەروەها کۆکردنەوەی لولەک و ئینجانەی گوڵەکان وەک هەموو ئەوانەی دیکە دەلالەتی رەمزی مێ لەخۆ دەگرێت. واتە ترسان لە شکانو بەربوونەوە یان بێ مانا نییە. ئێوەش شتێ دەربارەی ئەو دابە باوە دەزانن: کە لە کاتی مارەبڕینو دەستنیشانکردن کاتێ پەرداغێ یان قاپێکی شووشە دەشکێن. هەرپیاوێک لە ئامادەبووان دەست بەسەر پارچەیەکدا دەگرێ. ئەوەش لە راڤاکردندا بۆ قۆناغی شووکردنی بەر لە تاکانە دەگەڕێتەوە. واتە وازهێنان لەو هەقەی کەدەشێ بۆ هەر پیاوێک بەراست بگەڕێت. یان هەرپیاوێک وای دادەنێ ئەوکچە مارەی لەو ببڕێت.

نەخۆشەکەمان ئەو بەشەی لەکرداری تەقسەکەی بە یادەوەرییەکی دیاریکراوی منداڵی خۆیەو هەندێ خەواتر بەند دەکرد. ئەو کاتەی لە منداڵیدا دەفرێکی شووشەی بەدەستەوە بووەو بەربۆتەوە. دەفرەکەی لەدەست شکاوەو دەستی زامدارکردووەو خوێنێکی زۆری لێهاتووە.... ئینجا لەپاش ئەوەی کۆمەڵێک زانیاری بە هۆی ئەزموونی ژیانەوە دەربارەی

پەیوەندی سێکسی بەدەستهێنا ئیتر بۆخۆی ترس و دڵەڕاوکێی لەخۆ بارکردووە. بەوەی کە ئەگەر لەشەوی بەزاوابووندا دووچاری خوێنبەربوون نەبێت لەم حاڵەتە لای شوورەکەی گومان لە کچێتیو پەردەی بوکێنی ئەو دەکرێت. یاخود بەرامبەر خوێنبەربوون لەشەوی بەزاوابووندا ترسو دڵەڕاوکێ داگیری دەکات. کەواتە کۆکردنەوەی لولەک و ئینجانەکانی سەرکتێبخانە دەلالەت لە رەدیف وەرگرتن دەکات بەرامبەر شکان و زامداربوون. واتە شکانیش راستەوخۆ بە پەردەی کچێنییەوە خۆی بەند دەکا. بەڵام رەدیف وەرگرتن لەبارەی ژاوەژاو هیچ پەیوەندییەکی بەو مەسەلانەوە نییە..

لە لایەکی دیکەوە رۆژێک لەپڕ مانای سەرەکی تەقسەکەم دۆزییەوەو بۆم دەرکەوت کەبۆچی نایەوێت سەرینەکە بە داهوی دارینەکە بکەوێت. کاتێ گوتی:- سەرین هەمیشە دەلالەت لە نافرەت دەکات بەڵام داهوی چوارپایەکە پیاوە. بەو مانایە ئەو دەیەوێت بەکارێکی سیحری (ئەگەر ئەم گوتەیە بشێ) هەڵسێ ژن و پیاو لەیەک بکات. یاخود رێگای جووتبوون لە دایکو باوکی بگرێت. بەرلەوەی ئەو تەقسە دەستی بەسەردا بگیرێ بەماوەیەکی زۆر ترس بەسەریدا زاڵ بیوو. بۆیە دایکی بڕیاریدا دەرگای نێوانیان بە کراوەیی بمێنێتەوە. ئینجا دواتر ئەویش پارێزگاری لێکردوو پاشان خستییە دووتوێی تەقسەکەیەوە. بەمجۆرەش دەرفەتی چاودێریکردنی دایکوباوکی بۆ هەڵکەوت بۆئەوەی سوود لەو دەرفەتە وەربگرێ. چەند مانگێک خۆی دووچاری خەوزڕان کرد لەم ماوەیەشدا لەبیدی خۆی وای دادەنا لە میانی کاتێکو کاتێکی دیکەدا خۆی لەنێوان دایکو باوکیدا دەبینێتەوە. لەو کاتەشدا (سەرین)و (داهوی چوارپایە) بەڕاستی لێک جیادەبنەوە. دواتر بەهۆی ترس دروستکردنی وای لە دایکی کرد کە رێگەی پێبدات بچێتە پاڵ باوکی بێ ئەوەی هیچ لایەک هەست بە وەڕەسیو بێزاری بکەن. بێگومان ئەو هەڵوێستە پێشتر بیری لێکراوەتەوەو دەکرێ شوێنەواری لە تەقسدا پەنجەی بۆ ببرێت.

لەلایەکی دیکە ئەگەر سەرین رەمزی مێ بێت. ئەوا کرداری هەڵتەکاندنی لێفە تا لای خوارەوەی هەڵپەنمێ لەخۆیدا مانایەک دەنوێ ئەویش سکپڕبوونە. بەڵام ئەخۆشەکە هەوڵی لەباربردنی ئەو کارە دەدات کەماوەیەکە ترسی لەو حاڵەتەیە بۆیە وەک گوتمان هەمیشە چاودێری دایک و باوکی دەکات. ئەوەک بەیەک بگەنو منالێکی نوێ پەیدابێ و بەربەرەکانی ئەو بکات. کەواتە هەر بەومانایە سەرینە گەورەکە رەمزی دایکەو سەرینە

بچوکەکەش هەردەبێت رەمزی کچە بچوکەکە بێت. دانانی سەری ئەخۆشەکەمان بە ئاراستەی تەوەرەی نێوان شێوە دیاریکراوەکە بەو مانایەیە کە شێوەی دانانی هەردوو سەرینەکە وێنەی کۆئەندامی زاووزێی مێیینە دەگەیەنێت دانانی سەریش بەو ئاراستەیە رۆڵی ئەندامی نێرینە وازی دەکات (واتە رەمزی چوکە).

لەلایەکی دیکەش سەرنج راکێشانی ئیرۆسیانەی ئەو کچە بۆلای باوک سەرەتاکەی بۆ قۆناغی منالّی دەگەڕێتەوە یان بە مانایەکیتر گرێی (ئەلکترا) دەگەیەنێت دەستبەردانی خۆشەویستی دایکیش راستەوخۆ بەو مەسەلەیە پەیوەستە.. بەمجۆرە لە دووتوێی ئەو دوو نموونەیە بۆمان دەردەکەوێت کە دیاردەکانی دەمارگیری. هەروەک هەڵە (هەڵخلیسکانی زمان)و خەون مانایان لە توێی خۆیاندا هەڵگرتووەو هەموو ماناکانیش راستەوخۆ بە ژیانی ئەخۆشەکەوە بەندن.

لێرەدا. دەمەوێت قسە لەسەر دوو ئەنجامی گەورەو گرینگ بکەم کە تائێستا باس نەکراون.

یەکەم، هەردوو ئەخۆش شتێکیان لاجێهێشتم. ئەوشتەش بۆ بەشێک لە رابردووی ئەوان دەگەڕێتەوە. ناتوانن لێی جیاببنەوە بەڵام وەک گوتمان لەگەڵ ئەوەشدا بە ئێستاو داینەدیان نامۆیە. ئایا گەڕانەوە بۆ ئەوشتە نامۆیە پەیوەندیی بە کلۆڵی ساتەوەختی ئێستای ژیانەوە هەیە؟ وەک سەرنەکەوتنی زەواج لە ئەخۆشی یەکەم. یاخود پەیوەندیی بە بەشێک لە رابردووی لەبیرکراوی ئەخۆشدا هەیە؟..

ئەخۆشی دووەمو ئەوشتانەی کەدەکرێ بەکورتی ئیشارەتیان بۆ بکەین ئەوەیە کە لەبەرئەوەی ئەخۆشە بۆیە ناتوانێت شووبکات. لێرەدا دروستکردنی ئەو حاڵەتە پەیوەندیی بە ئیرۆسیەتی کچەکەوە هەیە. کە لە تەمەنی پێگەیین (بلوغ) هەستی پێکردووە. واتە ئەوەی لای ئێمە ئاشکرایە ئەوەیە ئەوکچە بۆیە شووناکات تاکو لای باوکی بمێنێتەوە. ئەوەش یەکێکە لە سیفەتە گشتییەکانی دەمارگیری. بەومانایەش دەکرێ بڵێین دیاردەکانی ئەخۆشو بەداوادهاتووەکانی ئەم دیاردەیە بۆ قۆناغێکی دیاریکراوی ژیانی ئەخۆش دەگەڕێتەوە. رەنگە بەمجۆرەش پەیوەندییەکی نزیکی بە سەدەمەی لە دایکبوونەوە هەبێت. بەومانایەش لەسەر ئەو ساتەوەختە جێگیر دەبن کە رووداوەکە تیایدا روویداوە بۆ نموونە لە ئەخۆشی هیستریادا دەبینین هەر نۆبەیەک کە ئەخۆش دەیگرێ دەکاتە هێنانەوەی تەواوی

هەڵوێستەکە، یاخود دووبارە بەبیرهێنانەوەی تەواوی رووداوە لەبیرکراوەکەیە. ئەوەش گرخواردنی نەخۆشە لە بارێکدا کە ناتوانی بە شێوەیەکی سروشتی وەڵامیان بداتەوە..
وەک لەپێشدا گوتمان دەمارگیری بۆ بەشێکی قۆناغی منالی دەگەڕێتەوەو لە زۆربەی باردا ئەو بەشەش جێگیرە، بەو مانایەش هەموو حاڵەتەکانی دەمارگیری جۆرێکە لە جێگیربوون، بەڵام هەموو جێگیربوونێک وەک پێویست دەلالەت لە دەمارگیری ناکات. بۆ نموونە غەم هەرگیز لە رێچکەی دەمارگیریدا ناژمێردرێت.

**دووەم**، لە شیکردنەوەی ئەو دەرئەنجامەدا بێ ئەوەی بکەوینە ئاڵۆزکاری، دەتوانین قسە بکەین وەک لە بارەی نەخۆشی یەکەممانەوە گوتمان: کردارە وەسواسییەکان لە رواڵەتدا هیچ مانایەک لەخۆناگرن. بەڵام لە دووتوێی یادەوەرییەکانەوە توانیمان پەیوەندییەکان بدۆزینەوە. هەرلەمیانی رابردووی لە بیرکراوی نەخۆشەوەش نیازی کردارە وەسواسییەکانمان دیاریکرد. بەڵام لێرەدا خاڵێک هەیە دەبێ بەرامبەری هۆشیار بین. جا کە نەخۆش درک بەو پەیوەندییانە نەکات، یاخود بەشێکی رابردووی خۆی لە بیر دەکاتو نازانێ پاڵنەرێکی تایبەت بەو کردارە هەیە، کە تاکە هۆی پۆزەتیڤی (ئیجابی) کردارە وەسواسییەکان لەخۆ دەگرێت پۆزەتیڤ بەو مانایەی کە دەرفەتێ بە رووداوە ئازاراوییەکانی رابردوو دەدرێت، یاخود بە مانایەکی دیکە ئامانج لە وەبیرهێنانەوەی رووداوە ئازاراوییەکانی رابردوو راستکردنەوەی حاڵەتەکانی رابردوو دەگەیەنێت. راستکردنەوەی حاڵەتەکانیش، یان پڕکردنەوەی بۆشاییەکانی ناخی مرۆڤ بەداهێنانی شیکردنەوەی دەروونییەکانەوە بەندە. بۆ نموونە:- ئەوەی لەکردارە وەسواسییەکانەوە بەمانا ناوزەدمان کرد لای نەخۆشی یەکەم ئەسڵەن وجودی نەبوو. کەواتە لە دووتوێی ئەو مانایەدا. رەوگە دەروونییەکانی ژیان کاریگەری دیاریکراو دەگێڕن. کردارە وەسواسییەکانیش جگە لە دەرئەنجامی ئەو رەوگە دەروونیانە شتێکی دیکە نییە. بەڵام لای نەخۆش هەموو مەرجە دەروونییەکان لە دەرەوەی مەعریفەو ئاگاداریییەوە خۆیان حەشارداوە بۆ نموونە (برنهایم) کە نەخۆشەکانی خۆی بە هۆی خەواندنی موگناتیسییەوە چارەسەر دەکرد، رۆژێک نەخۆشێکی خەواندبوو، ئینجا هەر لە خەوادا فەرمانی پێدا کە دوای بێداربوونەوە بە پێنج دەقیقە، چەترێ لە هۆڵەکەی بەرامبەریان هەڵبدات، کاتێ نەخۆشەکە بێداربۆوە وەک پێویست ئەو فەرمانەی ئەوی جێبەجێکرد، بەڵام بێ ئەوەی هیچ شتێ دەربارەی ئەو کردارە بزانێت.

بەومانایە پەیوەندی راستەوخۆ لە نێوان کردارە سەپێنراوەکانو رەوگە دەروونییە ناشعورییەکانەوە هەیە، هەرلە میانی ئەو پەیوەندییەشەوە ئەخۆشی دووەم کاتێ ناهێڵێ سەرینە گەورەکە بەر باهوی چوارپایەکە بکەوێت لە بنەڕەتدا پێچەوانەی حاڵەتەکەی ئەو نییە، بەڵام ئەو وای دەبینێ کە بە نیسبەت ئەو یاسایەوە بێزراوە. بێ ئەوەی بنەڕەتەکان هەست پێبکات. یان بێئەوەی بزانێ مانای چییەو پاڵنەرەکان درک پێبکات ئەو پاڵنەرانەی کە وزەکانی ئەو دەمژن...

فرۆید دەڵێ لەگەڵ (برویر) جەخت لەسەر ئەوە دەکەمەوە:- کە هەرجارێک بە بیاردەیەک لە بیاردەکان بگەین دەکرێ لە دووتوێی ئەم بیاردەیە رەوگە ناشعورییەکانی لای ئەخۆش کە مانای ئەو بیاردەیەی لەخۆ گرتووە دەستنیشان بکەین. بەڵام دەشکرێ ئەو مانایە بە ناناگایی بڕوات تا بە حاڵەتی بەبیارکەوتنی بیاردە دەکات. ئەوەی لێرەدا جێگەی ئیشارەت پێدانە ئەوەیە کە رەوگە شعورییەکان ناگوازرێنەوە تا بیاردەکان ئازاد نەکەین. واتە بە نەمانی بیاردەکانەوە دەتوانین ناشعور بەرەو شعور بەرین. ((برویر)) بە پێی ئەو تەکنیکە توانی ئەخۆشە هیستریدارەکە چاکبکاتەوە، یان لە بیاردەکان ئازادی بکات.. ئەو دۆزینەوەی ((برویر)) من بە شێوەیەکی دیکە دەریدەبڕم:- بیاردە لە بەدیلی شتێ پێکهاتووە کە نەیەتوانیووە خۆی بۆ دەرەوە دەربڕێت، واتە بیاردە بەرهەمی ئەو رەوگە لەکارکەوتووەیە  کە کۆمەڵێک کردار رێگای گەشەکردنیان پێگرتووە بۆیە بە ونبوونی بیاردەکان مەرجە ناشعورییەکان بەرەو شعور دەچن .

لێرەدا دەکرێ هەموو ئەوانە بەمجۆرە کورتبکەینەوە بڵێین گرینگی چارەسەرکردنی شیکردنەوەی دەروونی گواستنەوەی هەموو ماددە ناشعورییەکان (کەهۆی ئەخۆشییەکەن) بۆ ماددەی شعوری. هەروەها دەکرێ ئەوەش لەم شێوەیەدا خۆی بنوێنێ:- پڕکردنەوەی هەموو بۆشاییەکانی یادەوەری ئەخۆشو رزگارکردنیان لە فەرامۆشکردن کەواتە فەرامۆشکردنە دەمارگیرییەکان رۆڵی گەورە لە ئاشکراکردنی بیاردەکان دەگێڕن. رەنگە ئەگەر نموونەی ئەخۆشی یەکەم دووبارە بخەینە بەرچاو، دەبینین فەرامۆشکردن هیچ رۆڵێکی نییە، چونکە ئەو دیمەنەی (شەوی ئانومێدی بەزاوابوون) فەرامۆش نەکردووە. هەروەها هیچ فەرامۆشکردنێکی دیکەش لەم رووەوە لە دروستکردنی بیاردەکانەوە رۆڵی دیاریان نییە، ئەو هەڵوێستە لای خاوەن تەقسەکە کەمتر دیارە لەگەڵ ئەوەشدا هەندێ لە هەڵوێستی یەکەم

نزیکە. واتە کاتێ دەیەوێت دەرگای نێوان ژووری خەوتنی خۆیو باوکی کراوەبێت. یان کاتێ هەوڵدەدات دایکی لە شوێنی زەوجی خۆی دابەزێنێ. هەموو ئەوانە بەجۆرێک یادکردنەوەی پێوە دیارە بەڵام ئەوەی کە جێگای سەرسوڕمانە ئەوەیە کە ئەخۆشی یەکەم ئەو کردارە بێژمارە دووبارە دەکاتەوە. بێ ئەوەی بزانێ لە نێوان ئەوکردارەو ڕووداوی بە زاوابوون پەیوەندییەک هەیە.

لێرەدا مەسەلەی فەرامۆشکردنی یادەوەرییەکان نابێتە هۆی ڕاگیرکردنو دوورە پەرێزکردنی مانا. بەڵکو تەنها دابڕانێ لە پەیوەندییەکانە کە تیایدا وا لە یادەوەری دەکرێت ڕوداوەکان وەبیربخاتەوەو نوێیان بکاتەوە. بەڵام ئەگەر ئەم بۆ چوونە بە نیسبەت دەمارگیری وەسواسی باس بێ. ئەوە بێگومان بە نیسبەت هیستریاوە واناکەوێتەوە. چونکە ئەخۆشی هیستریا لە بیرکردنێکی بەرفراوان لەخۆدەگرێت. لە میانی شیکردنەوەی هەر دەمارگیرییەکی هیستریشدا زۆر بە ڕاشکاوییەوە لە بیرکردنی ئەو شتانە ڕادەگەیەنێت و دەڵێت لە بیرم چووە لە زۆربەی کاتدا ئەو زنجیرەیە بۆ ساڵەکانی یەکەمی ژیانی ئەخۆش دەگەڕێتەوە. واتە لەبیرکردنی هیستریانە لە بیرکردنێکی ڕاستەوخۆی مناڵکارانەیە. کەوا پەردەپۆشی قۆناغەکانی سەرەتایی حاڵەتە دەروونییەکان دەکات. ئەوەش هەر ئەخۆش ناگرێتەوە بەڵکو ساغەکانیش دەگرێتەوە. ئەوە لەلایەک، لەلایەکی دیکەش دەبینین لەبیرکردن درێژەی هەیە تا دەگاتە ڕووداوە نزیکەکانی ژیان بە دیارکەوتنی ئەخۆشیش واتە ونبوون لە نێو لە بیرکردنو فەرامۆشکردن. یان ونکردنی ڕاڤەکارییە گشتیو جوانەکانی یادەوەری. یاخود جێگرتنەوەی هەندێ یادەوەری درۆزنانە لە شوێنی یادەوەرییە ڕاستەقینەکان. هەندێ جاریش یادەوەرییە لە بیرکراوە دوورەکان دێن و شوێنی یادەوەرییە لە بیرکراوە نزیکەکان دەگرنەوە. سەرەڕای ئەوەی ئەو یادەوەرییە دوورانە کاتی خۆی بۆشاییەکی زۆریان لەسەر ڕەوتە ئیستاتیکییەکانەوە بەجێهێشتووە. گوتمان ئەو شوێنانەی یادەوەری سیمایەکی جیاکارانەی هیستریا بەدیاردەخات. هیستریاش کۆمەڵێک دیاردە لە تویی ئۆبەکانیدا لە خۆ دەگرێت کە بە شێوەیەکی گشتی شوێنیان لەسەر یادەوەرییەکان بەدیارناکەوێت. بەڵام ئەمانە لە دەمارگیری وەسواسیدا واناکەوێتەوە.

لێرەدا مانای دیاردە دەکرێت بە دوو جۆر تەماشابکرێت:- بۆچوونی ئەسڵی و بۆچوونی ئامانجدار – واتە یەکەم لە بۆچوونی ئەو ڕووداوانەی کە لە خۆیانەوە هەڵدەقوڵێ

و دووەم لەبەر رۆشنایی ئەو نیازەی کە خزمەتی بۆچوونی ئەسڵی دەکات. کەواتە لێرەدا بۆمان دەردەکەوێت کە ئەسڵی دیاردە بۆ ئەو بۆچوونانە دەگەڕێتەوە کە لەدەرەوە بۆناوەوە هاتووەو لە کاتێک لە کاتەکاندا واعی بوونە پاشان بەهۆی لە بیرکردن و فەرامۆشکردن کەوتونەتە دووتوێی ناشعورەوە، بەڵام ئامانجی دیاردەو نیازەکانی پێچەوانەیە. واتە لە هەموو حاڵەتەکاندا رەوگەی دەروونیو خودی ناوەوە بوونە. لە کاتێک لە کاتەکاندا وایان لێهاتووە کە ببنە واعی. بەڵام هەمیشە لە حاڵەتی وەعیشدا بەندی ناشعورن. کەواتە گرینگ نییە کە درێژبوونەوەی لە بیرکردن و فەرامۆشکردن ئەسڵی دیاردە بێت.

سەرەتا گوتمان لەکاتی وەقسەهێنانی ئەخۆش هەمیشە دووچاری وشەی نازانم. هەرهێنندەم لە بیرماوە. هەرنەوەندەیە.... دەبینەوە. لەلایەک هەموو ئەو ملەدانو بەرگریکردن و بەهیچ نەزانینەو.... دەکرێ بەرگرییەکی سروشتی حەزەکانی نیگۆی ئەخۆش بێت. بەو مانایەش هەموو ئەرکەکانی زاڵبوون کاری سەرەکی شیکردنەوەی دەروونییە چونکە ئەگەر شیکردنەوەی دەروونی بەسەر ئەو تەگەرانەدا زاڵ نەبێت هەرگیز رەوگە دەروونیەکان بەشعور ناگەنو دیاردەکانیش هەروەک خۆیان دەمێننەوە. لەلایەکی دیکەش تەواوی ئەو بەرگریکردنانەش پەیوەندی بە کەبتبوونەوە هەیە. یان بە مانایەکی دیکە ئەوەی ئێمە لە شێوەی بەرگری هەستی پێدەکەین بە سەرکوتکردن یان چەپاندن ناوزەد کراوە. هەر خودی ئەو کەبتکردنەش هۆی سەرەکی ئەخۆشییەکەو سەیرورەتی چەپاندنیش مەرجی ئامادەکراوی دروستبوونی دیاردە لەخۆ دەگرێت. ئەگەر کەبتکردن مەرجی پێشوو بێت بۆ دروستکردنی دیاردە. ئێمە هەروەک لە پێشەوە نیشارەتمان پێدا دەزانین کە دیاردە دێتە ئێرەوە تاکو شوێنی شتی دیکە پڕبکاتەوە. بەومانایەش چەپاندن دەکەوێتە نێوان ئەوەی بۆخۆی رایدەگەیەنێتو ئەوەی کە بەهۆی ئەوەوە دەگوازرێتەوە. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا نازانین ئەو پێکهاتە بەدیلە لەچی پێکهاتووە. ئەوەش تەگەرەیەکی دیکەیەو کۆمەڵێک پرسیاری لێدەبێتەوە.

بروانە:

النظرية العامة للامراض العصابية - فرويد ص٢٢-ص٥٨ ترجمة/ جورج طرابيشي دار الطليعة بيروت

## بەرهەمە چاپکراوەکانی نووسەر:

١- سێبەری ئاو – کۆمەڵە شیعر- ١٩٩٥.

٢- بانەمەنێک لە تەماشاکردنی ئاو بە ڕۆژبین – قەسیدە- ١٩٩٦.

٣- ئاگایی زمان زمانی ئاگایی –لێکۆڵینەوە- ١٩٩٩.

٤- تەنیا مەرگ –سێ دەقی شانۆیی-وەرگێڕانی لە عەرەبییەوە- ١٩٩٩.

٥- تەنیا ئاو تەنیا باران –کۆمەڵە شیعر- ٢٠٠١.

٦- پەیبردن بە ژیان –پەیبردن بە شیعرو بوون- لێکۆڵینەوە- ٢٠٠١.

٧- شیعرییەتی دەق –ئەدۆنیس- وەرگێڕانی لە عەرەبییەوە- ٢٠٠٢.

٨- مرۆڤ لە ڕوانگەی فرۆید –وەرگێڕانی لە عەرەبییەوە- ٢٠٠٢.

٩- خەیاڵی زمان –لێکۆڵینەوە- ٢٠٠٤.

١٠- شوێنکاتی یەکەم لە دووەم و ئێستای سەگوڕ –لێکۆڵینەوە- ٢٠٠٤.

١١- ئەدۆنیس: دوو گفتوگۆی ئەدەبی و فیکرییە- وەرگێڕانی لە عەرەبییەوە- ٢٠٠٥.

١٢- خوێندنەوەی پەرلوێز پەرلوێزی خوێندنەوە-لێکۆڵینەوە-٢٠٠٥

---

## ئەو بەرهەمانە بۆ چاپ ئامادەن:

١- ژیان دەڕوا ئاووئاو –کۆمەڵە شیعر.

٢- دریدا- ڕەخنە لە سێنترالیزمی خۆرئاوایی/ کۆمەڵێک وتارە لە عەرەبییەوە کراوەتە کوردی.

٣- خوێندنەوەی ئەزموون، ئەزموونی خوێندنەوە- کۆمەڵێک گفتوگۆو وتاری ئەدەبی و فیکرییە- لەعەرەبییەوە کراوە بە کوردی.